# دیوانی

# مەلا حەسەنی

# جەوهەریی

کۆکردنەوەوئامادەکردنی عومەری خوسرەوی

کتێبی ڕێی و شوێنی موسلمانی

« هەدیەی کوردستان » دانراوی جەوهەریی

لە کۆکردنەوە و ئامادەکردنی عومەری خوسرەوی بەم زووانە لە چاپ دەدرێ. وە بەم شێوەیە دەست پێی دەکا

---

ئیستقلالی کورد کە دامەزراوە
بناغەی لە سەر شەرع دانراوە

لە سەر ئیجازەی پێشەوای مەنسوور
جەنابی قازی رەئیسی جمهوور

تەواو دەنووسم ئەسڵ و فەرعی دین
بەشێعری کوردی رەوان و شیرین

(جەوهەریی ١٣٢٤ی هەتاوی چاپخانەی کوردستان مەهابادا)

# دیوانی
# مەلا حەسەنی جەوهەریی

کۆکەرەوە:

عومەری خوسرەوی جامەردیی

«بۆکان»

۱۳۷۶/۳/۲۴ ک ـ هـ ۲۶۰۹ ک

بەناوی خوای میری مەزن

ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : دیوانی جەوهەریی

کۆکراوەی : عومەری خوسرەوی جامەردیی

بلاوکەرەوە : ئینتشاراتی گۆران

پیت چن : ئینتشاراتی گۆران

تیراژ : ۲۰۰۰ دانە

نەوبەتی چاپ : چاپی یەکەم ۱۳۷۸

چاپ خانەی : گلبان چاپ

لیتوگرافی : قاسملو

## « پێشەکی ئینتشاراتی گۆران »

ئەوەی لە دلمانابوو وە ئەوەی کە پێویست بوو بەناوی بلاوکەرەوە بینووسین پێشتر مامۆستا مەلا عومەری خوسرەوی لە پێشەکی ئەم دیوانەدا لەوپەڕی زانستەوە بەشێوەیەکی ئەدیبانە دەری بڕیوە و هیچ نووسینێکی بۆ بلاوکەرەوە نەهێشتۆتەوە، بەڕاستی مامۆستامەلا عومەر چۆتە ناو دل هەموو نووسەر و ئەدیب و شاعیرێک، چی تیا بووە لە زمانی ئەوانەوە دەری هیناوە و نووسیویەتی. بەڕاستی زانا و شاعیرێک وەکوو مامۆستا مەلاحەسەنی جەوهەریی دەبێ هەر مامۆستا مەلا عومەر پێشەکی بۆ بنووسێ و دەرد و مەینەتی ئەو شاعیرە بەرزە، کە میراتی زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئەم کوردەواریەی ئێمەیە دەری ببڕێ و ئەو هەموو زاخاوە بهێنێتە سەر زاری قەلەم و بەسەر کاغەزیدا هەلڕێژێ کە زۆربەیشی دەرد و زامی خۆیەتی. جا ئێمە لێرەدا بۆیە دەربارەی جەوهەریی شتێ نانووسین، ئەم کتێبە بە دوو بەرهەم دەزانین لە یەک کتێبدا. یەکەمیان ئەو پەخشانە زۆر جوانەیە کە لە پێشەکی ئەم دیوانەدا نووسراوە، دووهەمیان دیوانەکەی جەوهەرییە کە مامۆستامەلا عومەر لە مێژە لە سەری خۆی ماندوو کردووە و بەرهەمەکەیشی جوان هاتوتە دی. جا ئێمەیش لێرە داواکارین دلسوزانی زمان و ئەدەبی کوردی وەکوو مامۆستا مەلا عومەر هەر بەرهەمێکی ئاوا دەناسن نەختێ خۆیان ماندووتر بکەن و بەدوای بکەون. چونکوو ئێستا زۆربەیان وان لە فەوتان و لە ناوچوونا. کۆیان بکەنەوە و بۆ ئێمەی بەڕێ بکەن تاکوو هەول بۆ لە چاپدانیان بدەین و بچنە ناو کتێبخانەی کوردییەوە. ئێمە بە ناوی بلاوگەی گۆران ماندو نەبوونی لە مامۆستا دەکەین و هیوادارین لەمە زیاتر خزمەت بە فەرهەنگ و زمانی کوردی بکا و بەرهەمەکانی دیکەیشی ئامادەی چاپ بکا بە سوپاسەوە.

سنە ( ئینتشاراتی گۆران بەرپرس حەسەن گۆران )

ئەم دیوانە کە لە دووبەشی کوردیی و فارسی و تاک و تەرایەکیش شێعری عەرەبی پێک هاتوە، زۆر لە مێژە بۆی هەلوەدابووم و ئاواتەخواز بووم رۆژێک بگا بەمرۆ. هیچ نەبێ با ئەو لوێچە کە لە خەرمانی بەرهەمی بابردووی جەوهەریی بە جێ ماوە، بەکۆ بکەوێتە دەست هەموان و ئەمانیش وەک ئەوان نەبنە سەدەقەی سەری گوێ نەدەران. شێعرەکان وەک تووی هەرزن پرش و بلاو بوون. ئەویش برێکی بە نووسراوی و هێندێکیشی پچڕپچڕ و لەت و پەت لە بەر ئەم و ئەو بوون. شێعرە کوردییەکان، ئەو وەختە چونکە بە رێنووسی فارسی نووسراونەتەوە، هیوابوە هەرجۆرێک بۆی خوێندراونەتەوە، هەرواش لە بەری کردون. بۆیە هەڵەی زەق و شتی ناڕاستیان تێوە پێچرابوو. لێیان کەم و زیاد کرابوو. هی لاوەکی و نامۆیان تێوە هاتبو. جا منیش هێناومە تەتەڵەم کردون و زریزانە و داڕوجانم لێ جیا کردونەوە و زرینگاندومنەتەوە و ئەوندەی توانیبێتم بۆ خۆم، دەنا بە بەراوەردکردنی دەستنووسەکان و پرسیار لە شارەزا و سەردەرچوان هەڵە و ناڕاستەکانم ساغ کردۆتەوە و روونکردنەوەم لە سەر نادیارەکان نووسیوە. شێعرە کوردییەکانم هێناوەتە سەر رێنووسی کوردی و پێشەکیم بۆ دیوانەکەش نووسیوە. بۆنە و هۆدانانی شێعرەکانیشم یا لەزاری ئاگالێبوانەوە، وەیان لە بەر نووسراوە و دەستنوسەکان نووسیوەتەوە. ئیدی نەبیروبۆچوونی خۆم تێدا دەربڕیون و نە هیچیشم لەو بارەوە لێ زانیوە ! جا بۆیە خۆم بە مشکولۆزمەی کەس نازانم گەردنم ئازا کا! وەباڵ بە ئەستۆی کوتوان.

منیش بەش بە حاڵی خۆم ئەم کارەم بە خزمەت و ئەرکی سەر شانم زانیوە

و ئەوەندەش کە بوم کرابێتو توانیبێتم لە پیناوی دیوانی جەوهەریی‌دا خۆم ماندو کردوە. جا ئەگەر بە کەیفتان بوو ! ماندونەبی بەکتان کرد یا نەکرد، ئەوە باشە دەنا سەرکۆنەم مەکەن چی دی لەوەباشتری لێ نازانم.

## لێرەدا

به پێویستی دەزانم سپاس لە هەموو ئەو بەڕێزانە بکەم کە ئەمەکداریی خۆیان سەبارەت بە خودالێخۆشبوو مامۆستا مەلا حەسەنی جەوهەریی بە جێ هێناوە و دلسۆزانە یارمەتی و دەستگیرۆییان کردوم. بەتایبەت :

١ ـ مامۆستا مەلا عەبدوللای جەوهەریی نەوەی مامۆستا مەلا حەسەن کە زۆربەی شێعرەکان ئەو پێی داوم.

٢ ـ کاک فارۆقی ئەدهەمی کە قوتابی مامۆستا بوە و هەر خۆزگە خۆزگەی بوو شێعرەکانی جەوهەریی رۆژێک ببن بە دیوان، بۆ دیتنەوەی شێعری جەوهەریی لە ماندویی کۆی نەکردوە و لە هەر کوێیەک شتێکی دەستکەوتبێ بۆی هێناوم و کتێبی دەستنووس (بەیاز)ی بنەماڵەی خۆیانی لە کاک پەشەنگی ئەدهەمی بۆ وەرگرتووم.

٣ ـ کاک عەلی سەلیمی ( پەشێو ) کە زۆرم پێوە ماندو بوە. بە شوێن ئاسەواری جەوهەریی‌دا تەنانەت ماڵانیشم بۆ گەڕاوە و لای ئەم و ئەو چوە. بەیاز (دەستنووس)ی خوالێخۆشبوو محەممەدخانی ئەحمەداوای بۆ خوازتمەوە کە بە خەتتی زۆر جوانی خوالێخۆشبو مەلا مستەفای ئەسعەدی ساڵی ١٣٦٢ ک ـ م نووسراوەتەوە و کەڵکی زۆرم لێ وەرگرتە. ئەو دوای بەڕێزانە کە نەکرا هەموویان نێو دێر بکەم، دوای داوای لێبووردن و سپاسێکی زۆری دوبارە، دەستخۆشیوونیان پێدەڵێم و دەستخۆشانەیان بۆ لە خودا داوا دەکەم.

بۆکان: عومەری خوسرەوی جامەردی

## نمونه‌ای از دست خط مرحوم ملاحسن جوهری

وجهالت را از دل و دیده ذکور و اناث و صغار و کبار ایرانیان زدوده ابواب معارف
و صنایع را در تمام نقاط دور و نزدیک مملکت ایران گشوده و در اندک مدتی گوی پیشی و برتری
و ترقی و تعالی را در میدان مسابقه از تمام دول دنیا ربوده افراد و احاد ملت در ظل عدالت و مراحم
یگانه شهریار با اقتدار خلد الله ملکه با خاطر مسرور و دل آسوده در بستر راحت و استراحت غنوده
لازم ذمه عموم و فرض حتمی است که در توالی شب و روز دست نیاز بدرگاه بی نیاز برداشته
دوام عظمت و رفعت و سلطنت اعلیحضرت شاهنشاه اسلام پناه ارواحنا فداه را تا انقراض
عالم تمنا نمایند و هر کس بقیمت خود در نشر علوم و ترویج صنایع و تشویق جامعه بتهذیب اخلاق
و دیانت ولذا سعی بلیغ در سایر ترقی دولت و دین و ملت با دل پر انبساط و سرور بکوشد
لذا این داعی دوام دولت ابد مدت هر چند با قدمهای کبر سن که تقریبا شصت مرحله از سالهای
زندگانی پیموده از خدمات بدنی نسبت بدوستان و میهن عقب مانده باز در حدود امکان و
وسعت نظر خود در تاریخ ۱۳۵۵ قمری هجری کتاب عبادات فقه حضرت شاهی را از عربی با بیات
فارسی ترجمه و بمدارس وطن محبوب برای آقایان و خانمان محترم و محترمه برسم ارمغانی تقدیم
داشته و امیدوارم در سایه شاهنشاه اسلام پناه خلد الله ملکه در نظر آقایان معلمین مطبوع و مورد استفاده
متعلمین واقع شده مایه افتخار و موجب سربلندی اینجانب گردد وما توفیقی الا بالله و هو حسبی و نعم الوکیل

بسمه تعالی

بدینوسیله آقای ملا عمر خسروی که پیرامون تحقیق و شرح آثار و تصحیح آثار جد بزرگوارم مرحوم ملا حسن جوهری همت ورزیده‌اند اجازه دارند که آن آثار را به هر نحوی که صلاح بدانند به طبع و چاپ و منتشر نمایند.

عبدالله جوهری نواده مرحوم ملا حسن جوهری امام جمعه و مدرس مسجد امام شافعی
بوکان

۲۰/۱۲/۷۶

# پێشەکی

لە باوەشی ئەم کوردەواری یەی ئێمەدا زۆر رۆڵە و کوڕپەی خۆشەویست پەروەردە بوون کە لە دوایی دا بوونەتە مرۆیەکی هەڵکەوتوو. زانایەکی زۆرگەورە، نێوبانگیان دەنگی داوەتەوە و نێویان کەوتۆتە نێو نێوان و بوونەتە ناسیاوی هەموان. ئاسەوار و دەستکردی رەنگینی گەلێک بە نرخ و بایەداریان بوە کە کۆڕی باسی زانایانیان گەرم کردوە و هەستی ئینسانی بە بیریان بزواندوە و خەزێنەی زمانەکەمانیان پێ دەوڵەمەندتر بوە و دەراوی دەمی وێژەوانانیان پێ پاراو بوە. لە کوردستاندا زۆر کوێرەدێی لاڕێ و چەپەک هەیە، ئەگەر وانەبوایە کەس بە سوراغی نەدەزانین و حەوەجێی بە ناسین و دیتنەوەیان نەبوو، بەڵام ئێستاکە ئەو زانا گەورە و هۆنەر و وێژەوان و مامۆستا بەدەستەڵات و پایەبەرزانەیان، لە داوێنی خودا گۆچ و پەروەردە کردوە، نێویان کەوتوتە سەر زاران و ئارەزوی دیداریان بۆتە ئاواتی دڵی هەزاران.

ئەگەر مەلا عەبوبەکری موسەننیف نەبوایە پێت وایە رێبواری کوێستانی زەنوێر و بە گوڵخەملیوی پڕ لە کانیاوی سەری کەوتەزێنی چلچەمە، کەڵکەڵەی چۆڕەچۆڕی چۆڕی بکردایە ؟!

یان ئەگەر جەوهەریی نەبوایە کێ گەشتی سەرشینکە و سەوزەڵانی خەمڕەوێن و سەیرانی دەشتی نەرمان و نەرمکردی پڕ لە گوڵی بەجێ دەهێشت و دەکەوتە نێو پێکوڵ و زەردەڕوی زەردەڕوی ئالانێ ؟

بەڵێ لە هەر جێ و دێ و شار و کوێرەدێ یەکی کوردستان دا زاناگەلی زۆر گەورە و خوداناسگەلی پایەبەرز و مامۆستایانێکی نێو بەدەرەوە و

شارەزای بێ وێنەی وامان بون کە هەموو خاوەنی گەنجینەی بەرهەم و شوێنەواری وابون کە سەر بە سەر لە گەڵ گەنجی قارونی ناگۆڕێەوە، هەموو زۆریان ڕەنج کێشاوە تا ئەو گەنجەیان پێکەوە ناوە بەلاَن داخێک و سەد داخ بە هۆی بێخێوی و بێخاوەنییەوە نە کەس بوە ماندو نەبی یان پێ بڵێ و دەستخۆشانەیان داتێ و لە کەساسیی دەریان هێنێ، وە نە کوتالیشیان بابرەوبەری زێڕیش بووبێ ویستیاری بووە. دەنا خوا عالەم راوێژی دەمیان ئەمیرە [1] کوردی بوخارای وا دەپەشۆکاند کە مێزەریشی دەخستە سەر پێلاَوان و بەسەری رووت و پێی پێخاوس ملی رێی دەگرت و باش تۆزی نەدەشکاند.

جا لە بەر ئەوە بەشی زۆریان کەمتەرخەمیان کردوە و بە دەست ڕەنجەکانیان نەچاراون و گرد و کۆیان نەکردوون، شتەکەش چونکە هی خۆماڵی بوە خەڵکیش بە هێندیان نەگرتوە و ئەو بایەخەی بۆ هی لاوەکیان داناوە بۆ ئەمیان دانەناوە. هەر تۆزەی بەدەست یەکێکەوە و هەر تێتوڵەی لە کەلێن و قەڵەشە دیوارێک تەپیوە. جا ئەگەر ئەوپیاوە مەزنانە و ئەو خاوەن ئاسەوارە گرانبایی یانە، رۆژێک، ماوەی مانەوەیان دوایی هاتوە و ماڵاوایی یان لە جێ ماوان کردوە، ئێمەی لە گوێی گادا خەوتوو، کاتێ دیتومانە دارەتەرم لە گۆڕستان دەگەڕێتەوە، تازە تێ گەیوین کە کۆشکێ

1 - مەبەست ئەمیر نەسری کوڕی ئەحمەدی سامانی کوردە کە دوای چەند ساڵ مانەوە لە بادغیسی هەرات بە بیستنی هەڵبەستەکەی (بوی جوی مولیان آید همی ...) ڕوودەکی وای لێ هات بە پێی پێخاوسی خۆی خستە سەر ولاخ و بەرەو بوخارا رکێفی لێدا.

سامانی نەتەوەکەمان چ قەوارەیەکی تێ بووە و چ خاوەن گەنجێکی ئایینی و نەتەوایەتیمان، لە دەست چوە، جا کابرا کوتەنی (دوای باران کەپەنک) کەوتوینەتە لە ئەژنۆدان و پەکو پەکو! کۆتەلمان بۆ رازاندونەتەوە و هەلمان کێشاون و بەشان و باهۆماندا هەلکەوتون و کەوتوینەتە بەیت و بالۆرە هەلبەستن، هەر بۆ ئەو پیاوە زانا و هونەرە بەرز و ئینسانە بلیمەتانە کە بەڕاستی هەلبەست و قەسیدەیان ئاوێنەی بالاڕوانی خووخدە و نەریت و سروشتی عەشیرەتەکانە، بەلاَن لە نێو ئێمەی خۆ خۆری هی خوێنەویستی دەم هەراشەدا، لە بەر نەداریی و هەژاریی ڕایەل و پۆیان لێ تێک چوو بوو!! هەر وەک خوالێخۆشبوو موفتی پێنجوێنی دەفەرموێ.

پیاوی گەورەمان نایەتە بەر دل
تاکوو ئەو رۆژەی ئەچێتە ژێر گل
ئینجا بۆی ئەگرین بە جۆش و بە کول
قەبرەکەی ئەکەین بە باخچە و بە گول

زانای پایە بەرز و کۆمەلناسی تاقانە و کەلە هونەری هاوال و هاوچەرخی جەوهەریی، مامۆستا مەلامارفی کۆکەیی دەلێ:

من و فازلی موکوریانی (جەوهەریی) کە پادشای ملکی قسە رەوانیین، لە بەر بێ نانی و بێ ئاوی و رەش و رووتیی مەرگ بە ئاوات دەخوازین. نە خۆمان بە هیند دەگیرێین و نە کوتالیشمان برەوی هەیە. لە کۆمەلێکدا کە تێر ئاگای لە برسی نییە و باو باوی هەڕ و گیف و خۆ هەلکێشانە و تێر خواردنی دارا سەربەرزیی نەدارە، دەی داماویی چۆن چاری دێ و دەردی هەژاریی بە چی دەرمان دەکرێ.

خسرو کشور غزلخوانی[1]
منم و فاضل مُکُریانی
اول این بنده شاعر معروف
حسن جوهری لقب ثانی
ما مهاباد و او بقهر آباد
هردو در غایت پریشانی
هردو افتاده همچو دُر بصدف
در ته قعر بحر ظلمانی
او ز بی برگی و ز بی چایی
من ز بی آبی و ز بی نانی
مقتدر نیستم که یکروزی
خوانم او را برسم مهمانی
با گروهی ز اهل فضل و کمال
دوستان موافق و جانی
یک نهار مفصل و مملو
از طعام بدیع الوانی
زایدالوصف قابل تمجید
یک نهاری بود حسنخانی[2]

---

١ - وەڵامی ئەم غەزەلە لە بەشی فارسی کتێبەکەدا هاتووە

٢ - حسنخانی : مقصود از حسنخانی، حسن خان قازیوا پسر عظام الملک است که گویا در سخاوت و مهمانداری و سفرهٔ الوان زبانزد خصوص و

این همه فاک و فیک و هیت و هوت
کی میسر شود به اسانی
مرض فقر را نمی‌بینم
بهر او دوا و درمانی
غیر رفتن بسوی دار بقا
غیر هجرت ز عالم فانی

هەر بۆ ئەو زانا بە دەستەڵاتانەی کە تا دوێنێ بوو لە بەر رووتی و ناچاریی پەنایان دەبردە بەر کابرای مێشک پووچەڵی دەستبڕی مفتە خۆر، کە عەبای کۆن و پەڕپووتیان بۆ بنێرێ ا لە بەر قەرزداریی رویان لە چۆڵی دەکرد.

روو لەبازارێ دەکەم ئەمجارە ئەربابی تەڵەب
هەرکەسێ تووشم دەبێ داوای دراوم لێ دەکا

بۆ قەند و چای منداڵی تامەزرۆیان پەنایان دەبردە بەر کەریمی لەچەر!!![1]

---

ضرب‌المثل بوده است.

١ - کەریمی لەچەر: مەبەست میرزا کەریمی شاتریی سابلاغە کە پیاوێکی زۆر ساماندار و دەستڕۆیشتوو بوە. مامۆستا مەلا مارفی کۆکەیی شێعرێک بۆ میرزا کەریم دادەنێ و بۆی دەنێرێ شتێکی بداتێ، میزاکەریم کە شێعرەکەی مامۆستا دەبینێ دەڵێ: ئەرێ ئەوە مەلا مارف ئەم قسە هیچەکە و پووچەکانە چی‌یە دەیڵێ و نێوی دەنێ شێعر؟! خۆ من لەوانە چاتر دەزانم. هەتا دەستی دەگرێ شێعرەکان فڕێ دەدا و دەڵێ: نەخێر نەوەڵلا نە شتم هەیە بیدەمێ و نە هیچ! مامۆستاش کە وا دەزانێ دەفەرموێ: ئەگەر سەد هێندی دی منداڵم چاوەڕوان و دەستەڕوانی ئەم و ئەو بن، ئەگەر ماڵ و منداڵی رەش و رووتم بۆ

دەچمە ماڵی ماڵ و منداڵ دێن و دەورەم لێ دەدەن
یەک تەمنای قەند و چا، یەک نان و ئاوم لێ دەکا

هەر بۆ ئەو پیاوە بەگەوهەرانەی کاتێ بیری ژێر سێبەری داری تووبا هەڵیان دەگرێ دەستی بە هێزیان بەهەشتی پڕ لە حۆریی دوورەدەست دەکێشێتە خوارێ و ڕێگا بۆ پیاوی هەژار[1] نزدیک دەکاتەوە !! بەڵان لە عەیەت

---

ژەمە نانێک و پیاڵەماستێک وەک خۆم سۆمایی چاویان دابێ، ئەگەر ناچاربم بچمە بتخانان و کرنۆش بۆ بتان بەرم، ئەگەر پەنا بەرمە بەرگاوران و بۆ سواڵ درگا بە درگا بگەڕێم یان ئەگەر کولۆلی و هەژاریی ئەوەندەی دیکە تەتەرپێچم کەن و دەرەتانم لێ ببڕن، شەرت بێ بە شەرتی پیاوان جگە لە کەریمی کارساز هانا نەبەمە بەر هیچ کەریم نێوێک. چوونکە بۆرە کەریمان تێکڕای لە کەڕامەت نەبانێ !!! دەنا پیاوی وەک من لە نێویاندا ئاوای لێنەدەقەوما !! مامۆستا ئەم سکالایەی لەو پێنجینە شێعرە فارسی‌یەی خوارەوەدا دەربڕیوە :

گر روم دیر و برم سجده به لات و به منات
ور ز مشرک طلبم فطر و زکات و صدقات
ور ببندم به هر شش جهتم راه نجات
نروم درگه اشخاص مسمّی به کریم
جز کریم که کریم است و رحیم است و رفیع‌الدرجات

١ - هەژار دەڵێ :

لێم بۆتە مەتەڵ بەهەشتە جێگەی حوورە
هەنگوین و کەرە و شیر و مەی و کافوورە
با ئێمە بە مەی لێرە بەهەشتێ ساز دەین
تا پیاوی هەژار دەگاتە بەغدا دوورە

سەرما و سۆڵ و كڕێوە و بادەوەی خاتوزمهەریر و كەسیرە بوونی منداڵی جگەرگۆشەیان، ناچار بوون بۆ سواڵی وردە و تەپاڵە و ئاورودوو، قەسیدەی وەک ئەلف لەیلا بە بەژن و باڵای كابرای خوێنتاڵی دەغەل و قەلب و رووكەشدا هەڵبڵێن !!

جا ئێمەی بە قسە زۆرزانی بەكردەوە هیچ نەزان، هیچ لە دەست نەهاتوی خۆ بە زڵزان زۆر بڵێی كەم كردەوە، زیندوو نەویستی مردو پەرست لە پەنای كورەی قەلاشكاریی وەیان لە ژێر كورسی گەرم و گوڕی بە كەمڕەنێڵدراو، بە شەقەی شەویلكەی سڕیان پێ كەنینمان دەهات و بە زەردەخەنەیەكی پڕ لە تەوسەوە دەستمان دەقوچاند و پێمان دەكوتن جا چۆن دەڵێن ساردە خۆ گوڵ ناچێ ؟!! تا لە برسا مردن و لە سەرما رەق هەڵاتن و مێشێكێشمان میوان نەبوو !! بەڵان پاشان كە تەمی بەرچاومان رەویوە و هاتوینەوە سەرخۆ و لە نەمانیان ئارخایەن بوین و زانیومانە كار لە كار ترازاوە، بە تاڵووكە كەوتوینەتە كەڵێن و قوژبن پشكنین و گەڕان بە دوای ئەوانەی لە ترسی دوپشكان خراونەتە كونە مشكان، وە یان كەوتوینەتە لەم و لەوێ لە خۆ بێ ئاگاتر پرسین بۆ دۆزینەوە و كۆكردنەوەی ئاسەواری پرش و بڵاو و گوێ پێنەدراوی خوداڵێخۆشبوان !!

یەكێ لەو زانا گەورە و هونەرە بە دەستەڵاتانەی كە نێو و نێوبانگیان، دیوناسی زانا دۆست و هونەر و زانست ویستان و كوتراویان شەو چەلەی كۆڕی میوان و دیوەخانان بوە، بەڵان تا ماوون تێیان هەڵەنگوتوین و پاش مردن سۆرانیمان بۆ شین كردون، خوداڵێخۆشبوو مامۆستا مەلا حەسەنی جەوهەریی یە.

## مەلا حەسەنی جەوەریی کێیە؟

مەلا حەسەن کوڕی مەلا عەبدوڵڵای زەردەدڕووە. باپیری جەوهەریش مەلا حەسەنی زەردەدڕووە. مەلا عەبدوڵڵا و مەلا حەسەن بۆیە بە زەردەدڕوو بەناوبانگ بوون چونکە خەڵکی دێی زەردەدڕووی لای ئالانی سەردەشت بوون. دایکی جەوهەریی نێوی شایجان و خەڵکی بایندەریی لای سابلاغ بوە. جەوهەریی کوڕ و کچێکی دەبێ، کچەکەی تەمەنی لاویی بەسەر نابا و جوانەمەرگ دەبێ. کوڕەکەی نێوی مەلا عەلی بووە کە ئەویش لە دەوروبەری تەمەنی چل ساڵی دا دەمرێ. مەلا عەلی کوڕ و کچێکی بووە کە ئێستا ماون. کوڕەکەی نێوی عەبدوڵڵایە و ئێستا مەلا و دەرس بێژی مزگەوتی شافیعی بۆکانە، کە من ئێستا ئەو کورتە بەسەرهاتە لە زمانی ئەوەوە دەنووسم، جا ئەگەر ناتەواو و گرێ و گۆڵی تێدا بێ ئەوا ئەو هەر ئەوەندەی لێزانیوە و منیش هیچم لێ نەزانیوە. ئەگەر کەسێکیش لەو بارەوە شارەزایی باشتری بێ و دەستگیرۆییمان بکا، زۆر جێی سپاسە.

جەوهەری لە ساڵی ۱۲۵۴ی هەتاوی‌دا لە دایک بووە و لە ساڵی ۱۳۳۷یش لە تەمەنی ۸۳ ساڵی‌دا لە گوندی کوێرەگوێزی گەوورکی سەقز، لە ماڵی مەلا ساڵحی برای کۆچی دوایی کردوە و هەر لەوێ نێژراوە. جەوهەریی مامۆستایەکی زۆر بەرز و زانا بوە. زانست و عیلمەکانی ئەو سەردەمەی بە تەواویی خوێندوە و بە پلە و پایەیکی زۆر گەورەی زانستیی گەیوە و شارەزاییەکی باشی تێ‌یاندابوە جەوهەریی بە فەقێ‌یەتی لە دێی جامەرد (زێدی نووسەر)ی ناوچەی بۆکان لە لای مەلا شەمسەددینی شێخولیسلامی، (بنەماڵەی شێخولیسلامی بنەماڵەیەکی گەورەی ئایینی و

مەلای زۆر زانا و نێوبەدەرەوەیان بوە. وەچەی ئەو بنەماڵە ئێستا زۆرتر لە بانە و سەقز و دەوروبەر نیشتەجێن ) وە لە دێی عەمبار هەر لەو ناوچەیە لە لای حاجی مەلا شەفیعی بابی مامۆستا مەلا حیسامەددینی بۆکان، وە لە لای مەلا عەبدوڕڕەحمانی کەیانی مـەلای مـزگەوتی سـووری سـابلاغ خوێندویە، کە ئەوانەش مامۆستای زۆر گەورە و بەنێوبانگی ناوچە بوون. هەر وەک بۆ خـۆشی لە ( قـەسیدەی ) ئـامۆژگاریی و پـاڕانـەوەکـەیدا دەیدرکێنێ ماوەیەکیش چـۆتە عـێراق و لە کـەرکووک و سـولەیمانی و هەولێر خوێندویەتی. بەڵان ئەوەندەی پێی ناچێ کەڵکەڵە و بیری وڵاتی خۆی دەکەوێتە سەری و ئارەزوی دیمەنی جوان و ئاو و هەوای چـیای سەربەرز و سەیرانگای دڵڕفێن و خەفەت تارێنی ئاویدەری[1] شاری سنە، هەڵیدەگرێ و گەرمای کەرکووک و سولەیمانی بە جێی دێڵێ و دێتەوە و دەچێ لە حوجرەی مزگەوتی دارولئێحسانی ئەو شارە جێگا دەخوازێتەوە و دادەمەزرێ و لەوێ دەست دەکا بە خوێندن. جـەوهەریی دوای ئـەوە خوێندنی مـەلایەتی تـەواو دەکـا و دەبـێتە دوازدە عـیلم، ئـیجازەی[2]

---

١ – ئاویدەر کێوێکی بەرز و جوانە کە کانی شەفا سەرچاوەی دڵی تەڕی ئەوە و لە باشووری سنەدا هەڵکەوتوە و سەیرانگای زۆر خۆشی خەڵکی ئەوێیە . شار ئێستا سەری کردۆتە سەر باوەشی.

٢ – بەداخەوە نەمزانی لە کوێ مەلایەتی تـەواو کـردوە ( ویـدەچێ لە سـنە ئیجازەی وەرگرتبێ ) و لەخزمەت کام مامۆستاش ئیجازەی وەرگرتوە ! لە مەلا عەبدوڵلای نەوەی جەوهەریم پرسی مامۆستا لە کوێ ئیجازەی وەرگـرتوە ؟ کوتی نازانم !! کوتم ئیجازە نامەکەی لە کوێیە ؟ کوتی نەماوە !!

مەلایەتی وەر دەگریٚ و دیٚتەوە و لە گوندەکەی خۆیان کە دەڵێن باخچەی فەیزوڵلابەگیی بوە، دەبێتە مەلا. جەوهەری لەم دیٚیانەی خوارەوە مەلایەتی کردوە: جامەرد. باخچە. ئالبلاغ. ترکاشە، شاریکەند قارەوا، قازانتا، قادراوا و نیسکاوا (ئەم دیٚیانە لە ناوچەی بۆکانن). قالویٚ زەندان زگدڕاو (ئەمانەش سەر بە سابلاغن). لە بریٚ جیٚش فەقیٚی ڕاگرتووە و دەرسی کوتۆتەوە جەوهەریی هەر وەک مەلایەکی زۆر زانا و گەورە بوە، هۆنەرێکی بەدەستەلاٚت و بیروورد و شێعر ناسک و ڕەوانە. لە دەریای شێعری کوردی و فارسی و عەرەبیش دا، مەلەوانێکی بە هێزو چالاکە. بە زمانی خەڵکی شێعری کوتوە. ووشە و زاراوەی ئەوندە جوان و ڕەسەنداری هەڵبژاردوە کە ڕەنگە کەس نەکردوبیٚ. دەستەلاٚتی زۆری ماموٚستا، لە بواری شێعر و هەڵبەستدا و لێهاتویی و پلەی بەرزی زانیاریی ئەو، دەبیٚ لە ئاوێنەی هۆنراوەی کۆمەڵناس و کەلە هۆنەری هاوچەرخی جەوهەریی، ماموٚستا مەلا مارفی کۆکەیی‌دا، تەمەشاکەین کە بە کوردی و فارسی ڕوی تێدەکا و پیٚی دەڵی،

دل سەلامت لێدەکا چاووم عەزیزم جەوهەریی
گەرچی جیسم و سوورەتی ئەمما سەراپا جەوهەری
ایکە در آفاق و اقلیم فصاحت گستری
صف زده بر درگهت چون بندگان صد انوری
ریزە خواری سفرە طبعت هزاران بونواس
خوشەچین خرمنت یغما و ما و عنصری

از برای آنکه لاف همسری با تو زند
چارهٔ دیگر نباشد جز رجوع قهقری
می‌نویسم دمبدم بر صفحهٔ رخسار دل
آفرین برجسم و جان و جوهرت ای جوهری

ئەو کاتەی ماموٚستای جەوهەریی لە سنە دەخوێنێ، میرزاعەلی موعتەمەدی کوردستانی کە لە خەتخۆشیدا بە نێو بانگ دەبێ و شاعێریش بوە، لە نزیکەوە بەڕادەی زانایی و گەورەیی ماموٚستا و سوار چاکیی مەیدانی شێعر و هەڵبەستی، ئەو شارەزا دەبێ و باش دەی‌ناسی، ئاوای پێدا هەڵدەڵێ:

ای مهین سالار دوران ادب ملاحسن
جوهری کز فکر بکرش عالمی شد جوهری
حافظ و سعدی شیرازی و سنائی و حکیم
بیدل و فردوسی و جامی، رضا و عنصری
زنده بودندی در این ایّام کی یارای آن
داشتندی در هنر گویند لاف همسری
دلبر موزون و زیبا در کجا باشد زند
با یکی از شعر او یک ذرّه لاف دلبری
صرفه برده گر دو صد درّو گهر را داده است
در بهای هر یکی از بیت نغزش مشتری
من که آن قدرت ندارم در بهای شعر او
جان و دل دارم فشانم تا ابد در چاکری

دم مــزن از شــعر و هــان هشــیارباش ای مــعتمد
خــتم بــر فکــر دقــیق جــوهری شــد شــاعری

*****

کاتێ نووسراوەی فارسی مامۆستا دەخوێنیەوە، بۆنی گولستانی سەعدیت بە سەردا دێ! ئەگەر تەمەشای دەستکردی ڕەنگینی ئەو پیاوە دەکەی کە بە عەرەبی نەخشاندویەتی ( قُسّ بن ساعده )ت دێتە بەرچاو ! خۆ ئەگەر ویستت تاسەی دەرونی کەیلت بە شێعری بەتام و ئاوداری کوردیی جەوهەریی بشکێنی، لە نەکاو تەمەشا دەکەی ئەوا لە سەر جۆگەلە شێری کەوسەر بە سێبەر و بەری داری تووبا خەنی بۆی و لە کۆشکی بلووریندا دەست لە ملانی حۆریی بەهەشتی. جەوهەریی بە سەر مێژووی کۆن و تازەش‌دا شارەزاییەکی باشی بوە و کون و قوژبنی چاک پشکنیوە، لەو چەند هۆنراوەیەداکە لەمەولا دێو هی پارچە هەڵبەستێکن، دەردەکەوێ کە مامۆستا چەند جوان مێژوی زانیوەو بە وردی ئاگای لە سەرو بەری بوە.

بــیاور ســـاقی ســیمین بــدن جــام ســروراَور
بگــاه صــبح بــیرون ساز از دل غــم، خــمار از ســر
تو ای مــطرب بــزن یک پــنجه بــر تــاری بــه یــاد یــار
مــغنّی خــوان نــوائــی را بــه یــاد خســرو و قــیصر
یکــی مــجلس بــیارائــید و شــمع جــمع روشــن کــن
گــلاب و عــطر افشــانید و عــودی ریــز در مــجمر
بــبزم مــا، بــخوان امشب نکــیساو بــاربد هــر دو
بکــام دوست مــیگردد بــحمدالله مــه و اخــتر

کیومرث و ز هوشنگ و ابا طهمورث و جمشید
فریدون، سلم و تور و ایرج و بهرام بانوذر
انوشیروان و خسرو، نادر و شاپور و شاعباس
ز کیکاوس و کیخسرو ز دارا و ز اسکندر
امیران اروپا تا سلاطینان عثمانی
ز اوّل تا نهایت پادشاهان عجم یکسر

*****

جەوهەریی لە ساڵی ١٣٥٥ی کۆچی مانگی دا بەشی عیباداتی فیقهی حەزرتی شافیعیی بۆ هاووڵاتیانی شافیعی مەزەبی خۆی بە شێعری فارسی رەوان و ساکار وەرگێڕاوەتەوە. کاتێ کتێبەکەی تەواو دەبێ دێنێ پێشکێشی دەکا بە قوتابخانە دەوڵەتیەکان و لە گەڵ نامەیەکی زۆر ماموٚستایانە دەی‌نێرێ بۆ رەزاشاو داوای لێدەکا کە چاپی کەن و بیدەن بە قوتابخانەکان تا منداڵان و ماموٚستایانی شافیعی مەزەب، بە تایبەت قوتابیان و ماموٚستایانی ناوچەی کوردستان بیخوێنن و کەڵکی لیٚ وەرگرن. لە نامەکەدا بە رەزاشا دەڵێ لەو هەمو ئەرکەی بە سەرشانی هەموو هاووڵاتیەکەوەیە کە بۆ هاو وڵاتیەکانی خۆی بە جیٚی بیٚنیٚ، منیش بەش بە حاڵی خۆم ئەوەی لە دەستم هاتوە بە جیٚم هیٚناوە و ئەوە بە شانازیشەوە پێشکێشی دەکەم. تا ئەوە خوڵایەگەردنم ئازاکەن و مشکولۆزەمەیان نەبم! بەڵان رەزاشا چونکە دوژمنی قین لەدڵی کورد و مەزەبەکەشی بوو، نەلیٚ ی وەرگرت و نە بوی چاپ کردو نە گوێشی پێدا!

جەوهەریی هەروا لە ساڵی ١٣٦٨ی ک ـ م شدا عاقیدەی ئیمان و ئیسلامی بە دو شێوەی کوردی پەتی و فارسی ساکار بە شێعر هۆنیوەتەوە و دایناوە.

مەولودنامەیەکیشی بە هۆنراوە و پەخشانێکی رەوان و جوان بە کوردیی نووسیوە. جگە لەوانە مامۆستا هەڵبەست و هۆنراوەیەکی زۆری بە کوردیی و فارسی بوە کە بڕێکی کەمی دیارە. لە خەرمانی شێعری بابردوی جەوهەریی کە وەک توی هەرزنی لێهاتبو، نزیکەی پێنسەت و سێ شێعرێکم خڕ کردۆتەوە و پێشکێشی خوێنەرانی عازیزم کردوە. شێعری جەوهەریی، ئەوانەی کە بەرهەمی جەنگەی شایی بە خۆبون و دڵخۆشی بە ژیان و جوان‌دیتن و جوان ویستیی و خۆشەویستی و ئەویندارییی‌یە، وە هەروا ئەوانەی کە هی هەڕەتی هۆنینەوەی شێعری ناسک و ئاودار و بە تام و بون و هی جەفەنگی و گاڵتە و گەپە، یان هەر تێداچۆن و نەماون، وەیان کەوتونەتە لای ئەم و ئەو و هێشتا کۆنەبوونەتەوە کە بە تێکڕا بیخەینە بەردەست خوێنەرانی بەڕێز.

هیوادارم ئەوانەی نووسراوە، یان هەڵبەست و ئاسەواری جەوهەریی‌یان لە لایە دڵسۆزانە یارمەتی بکەن و ئەو ئاسەوارانەمان بۆ بنێرن. بەڵکو بە یارمەتی هەموان هەموی بکەوێتە دەست هەموان .

مەلا حەسەنی جەوهەریی خۆی بە خەلیفە و مەنسوبی بنەماڵەی مەزنی کوردی ساداتی نەهری زانیوە و ئۆگری‌یەکێ زۆری بە ماڵی حاجی سەید عەبدوڵڵای شەمزینی بوە. جا بۆیە بە خەلیفە مەلاحەسەنی جەوهەریی بە نێوبانگ و ناسراوە.

جەوهەریی لە تەمەنی حەفتاو یەک ساڵی‌دا تووشی جەرگ سووتان دەبێ، هەروەک لە پێشداکوترا مەلا عەلی کوڕی لە جەنگەی مەلایەتی‌دا دەمرێ ! مەلا عەلی کە مەلایەکی باش و تەنیا یادگاری ژینی پڕمەرارەتی جەوهەریی‌یە، وەک هەودایەکی ئاوریشمین دڵی باوکی پیر و زورهانی بەو

مانی پڕ لە نەمانەوە، بەستۆتەوە! جا بۆیە بە مردنی مەلاعەلی ژیانی پڕپیتی ئەو پیاوە زانایە بە تەواوی دەشێوێ، ئیدی دلخۆشیکی بە ژیان نامێنێ و سەرچاوەی ڕووناک و زولاڵی بیری پڕ گەواهێراتی لێل و لیخن دەبێ. دنیای لێدەبێتە گۆڕێکی تەنگەبەری ڕەشی پڕسام کە تەرمی ژینی ساردەوە بوی گۆرەوشار دەدا! مالی لێدە بێتە گرتوخانەیەکی توناوتوونی عەستەم کە لە بەر ئێشی لەشی ئەشکەنجەدراوی زاماری تێیدا ئۆقرەی نی یە! وای لێ دێ واز لە هاواڵ و هاوبەشی ڕۆژانی خۆشی و تالیی ژینی بە سەرچوی دێنێ و بە سەری پیری هاوسەری تەمەنی لاویی و پیریی تەلاق دەدا و مالەکەی پڕش و بلاو دەکا. وەک ئەوە کە بیەوێ لە داخی دنیای پووچەڵ خۆی بەرێتەوە سەر دۆخی پێشوو. ڕووت و قووت لە سەر لووتکەی ترۆپی تەمەنیەوە چاوێک بە شریتی عومری ڕابوردوی دا دەگێڕێ و سەر گوزەشتەی ناهومێدی خۆی دەور دەکاتەوە. دەڕوانێ ئەوا ڕۆژی تەمەنی دەمی بەکەلەوە ناوە. جەرگی سووتاوە، ژینی شێواوە، ماڵ و حالی نەماوە! بارستایی خەم لە دلی شکاویدا وای قورسە بەستوە، پشوی لێ بڕاوە! جانازانم هۆنەرکە دەلێ :

لە سەر[1] بستوی ژیان وەک داری چاکی
بە تەنیا مامەوە بێ بەرگ و بێ بەر
گەلێ بێ تینترە تاوی هومێدم
لە زەردەی ڕۆژپەری مانگی خەزەلوەر

---

١ - ئەم چوارینە هی کاک موحەممەدی نووریی ( عەتریی گولۆلانیی ) هۆنەری بیروورردی بۆکانی یە .

لە هانای دەمی لە گۆ کەوتوی جەوهەریی هاتوەو هاواری لە گەروگیراوی ئەوی دەربڕیوە یان خۆ کراسێکە بە بەژنی خۆی بڕیوە و پڕ بە بەری هەمو بە گەوهەرانی کوردەواریشە ؟!!

هەر چەند هیوای پتەوی جەوهەریی بە خودا و بڕوای قایمی نەی‌دەهێشت لە بەرانبەری کۆسپ و قۆرتی باری نالەباری ژیانیدا، جا با ئەوندە تفت و تاڵ و بڕستبڕیش بێ، ورە بەرداو ناهومێد بێ، بەلاّن عیسان، عیسانە، با حــەزرەتی ئــادەمیش بــێ هــەر دەبــێ لە شــەڕی شــەیتان بـترسێ، نەکاسەرەنگرێی داو بە سەر زەللەی پەڕێنێ. جا بەناچاری بۆ دامرکاندنی گڕی دڵی پڕ لە کوڵی، بەرەولای پیری دەستگیری، ملی ڕێ دەگرێ و هانا دەباتە بەر خانەدانی نەهری و دەچێتە خزمەتی حاجی سەید عـەبدوللا. ئیدی دەست لە داوێنی دنیا بەردەدا و دەیەوێ دوایـن ڕۆژەکانی ژینی لە ئاوابوونی لەوێ بەرێتە سەر و بمێنێتەوە ! حاجی سەید عەبدوللاش کـە جەوهەریی زۆر خۆش دەوێ و پلە و پایەی بەرزی زانستیی و هونەریی ئەو باش دەزانێ ڕێز و حورمەتێکی زۆری لێـدەنێ و وەتـاغ و مـەنزڵی تایبەتی بۆ تەرخان دەکا و زۆر باش دەستی قەدری لێدەنێ. جەوهەریی هەر چەند واهاتبو کە هەتوانی دڵی برینداری لەوێ گیر خاو پاش ماوەی تەمەنی لەوێ بەرێتە سەرا بەلاّن پاش ماوەیەک بیر و تاسەی برا و نەوەکانی دەکەوێتە سەری و دێتەوە بۆ کوێرە گوێز، بۆ ماڵی مەلاساڵحی برای و تا دوایی ژیانی لەوێ دەمێنێتەوە.

بەرواری ٢٤/٣/١٣٧٦ ک ـ هـ ٢٦٠٩ ک .

بۆکان ـ عومەری خوسرەویی جامەردیی

« پەسنی پێغەمبەر » (د ـ خ)

ئـــەسمائی شەریفی شەرەفـــی عەرشـــی بـــەرینە
مـــــومتازە لەخەلک ئـــەحمەد و مەحموودە ئەمینە
تـــەشبیهی قـــەدی ڕێک و دلارای بـــە چـــی کەم
هـــــەرچـــی کــە بـلێم چـــاترە بـاڵاتــری نــینە
یــا ڕەب مـــەکـــە ئـــەم سینەمە خاڵی لە خـەیالی
بـــێ قــیمەتە ئـــەنگوشتەری خـــالیـــی لە نگــینە
مســـەلمانی ســـولەیمانە دەبـــێ عـــوممەری چی بێ
فـارووقــێکــە مـل بادەری شـەیتانی لەعـینە
حـــــــەبەش خـــــادیمی درگـــــاهی بـــــیلالی
کـــەمتر خــــەدەمی خــادیمەکــانی شـــەهی چـینە
شـــــەرحـــــی دەرەجەی گەورەیی یارانـــــی چ نادەم
جـــــەوادە، خــــوداداده، ئــــەدەب زادە، مــــەکــینە
مــێعــراجــی بــە یــەک دەم لە شــەوی تـار و سـیا دا
ســـووڕهـــێنـــەری ســـەر بـۆ بـەشەری واقـیعەبینە
هــــەر تـــا دەگـــەمە خـــزمەتی، بـێ وەقـفە بـراکـەم
بـــەم مـــەرهەمە سارێژی کـەم ئـەم هـەمووە بـرینە
خـــاکـــی دەری پـاڕامـــی دلە دائـــیمە جـێـی بـێ
بێ بەش نەبێ بـەلکـو لە عـەتای ئـەم شـەهی چـینە
بـەم شـەوقەوە عـەزمی سـەفەری مـلکـی سـەبا کـە
قـــەسدی ســـەفەری وا بـــەری عـــەزمێکـی مـەتینە
ســـۆزێکـــی لە دل دایـــە، دل ئــاوایـــە، بـــلێسـەی
پـــرشـــنگێکـــە لەو نـــووری درەخشـــانی مـــەدینە
شەوقی ئەوە تۆشـەی سەفەری (جـەوهەریی) هـەردەم
ئـــەو شـــەوقە حـــەیاتی مـــنی غـــەمبار و حـــەزینە

## « ئامۆژگاریی و پاڕانەوە »

ئەرێ ئەی نەفسی بێ شـەرم و حـەیاتاکـەی هـەوەسرانـی
هەتاکەی غەفلەت و سستی، هەتاکـەی جـەهل و نـادانـی
هەتاکەی پێرەوی شەیتان و رێگەی خوار و خێچدەگـری
هەتاکەی سەرکەشی و فیسق و فجور و کـیبر و تـۆغـیانی
لە بیرتِ ماوە دەورەی زیندەگانیت چـۆن بـە سـەرداهـات
لە منداڵیـتەوە تـا عـەسری پـیریی و عـومری نـۆجـوانـی
سەراسەر بۆت حیساب‌کەم عومری شیرینت چـلۆن ڕابـرد
چلۆن لات‌دا لە رێی حەق، کەوتیە رێی تاریک و زولمانی
نـەبۆ دنـیا نـە بـۆ عـوقبا بـە کـاری خـۆت و کـەس هـاتی
نە قەول و فێعلی چاکت بـوو لە هـەر دو لاوە خـوسرانـی
لە بـەر قـاپێن و مـەزرەق داکـوتان و خـازەڵێ و بـازی
بـە مـنداڵی نـە چـوویە مـەدەرسەی تـەحسیلی ئـینسانی
بە رۆژ مێشێن و تـۆپێن سـەنعەتت بـوو تـاکـو رۆژئـاوا
بـە شـەو گـورزێن و شـایی تـا تـلووعی رۆژی نـوورانـی
بـەزللە یـا لە بـەر داردەسـتی مـامۆسـتا بـرێکت خـوێند
لە ئەلف و بێ و حینجە و سایە، دووسێ جۆزوی قورئـانی
لە تـۆمـاری سـمایل‌نامە نـەختێ، نـاگـەهان دووپـەر
ئەویشت زوو فەرامـۆش کـرد و نـەت فـاماند و نـەتزانـی
لە لای خۆهاتیە سـەر نـووسین و مـەشقی فـارسی ئـەمما
هـەتا هـاتی خـرابـتر بـوی لە بـەر قـەلبـی و گـرانـجانی

له خەتتی فارسی و تازی نەسیبێکت نەبوو حەیفێ
له شێوەی رەسم و نەسخ و نەستەعلیق و رەیحانی
دەورەی مەکتەبا وا بوو کە کەوتیە مەدرەسەی عیلمی
دوو سێ نەوعت عەوامیل خوێند له دوی تەسریفی زەنجانی
له سەعدوللا چکۆلە و شەرحە موغنی، دووپەرولاێێ
له سەعدینی هەتا فەسل و بە جێت هێشتن بە نوقسانی
له وەلع و ئیستیعارە و جامی و سیوتی کە سەر کەوتی
وەدوی نەفس و هەوا کەوتی و کەوتیە مەشقی شەیتانی
موتالای دەرسی رۆژانت نەزەر بازی و ئیشارەت بوو
له باتی دەوری سیوتی هەردەلێ باباو گۆرانی
شەوی سێ شەممە و جومعە هەتا رۆژ گۆرەوی بازی
له تاو کەوتن هەتا ئێوارێ هەر کەوشێن و زۆرانی
لیباسی جاهیلانت کردە بەر بۆ ملقوتەی بانان
کلاوی لار و پشتێنی زل و ئەنگوچکە سوڕانی
کە دەستت کرد بە مەنتیق چینس و فەسلێکت کە حالی بوو
بە دەعیەو فیزەوە بالتەی دەبیبت خستەلاشانی
کەوای قوتنی درێژت راست لەپەنجەی کەوشی سووردەخشا
کەتانی ریشووەدارت پێچ دەدا وەک بەفری
مووتەوولبوو بەدەرست،موختەسەردەرچوی لەخوێندنا
بەدیعت وەک بەیان، ناقیس مەعانت نیوەچل زانی
خەیالی خوێندنی جەمعولجەوامیع کەوتە سەر فکرت
لە گەل مینهاج و ئیبنولقاسم و تەحریری بەنتانی

له تــه‌جریدو مــواقــیف، قــاضی لاریـــی و چـــه‌غمینی
له ئـوستورلاب و زیـج و هــه‌نده‌سه، ئـه‌شكالی بـورهـانی
له‌وان عیلمانه هه‌ریه‌ك یـه‌ك دووبـه‌حس ومـه‌سئه‌له‌ت خـوێنـدن
له لات وابـــو تــه‌واو بـــوی وه‌ك مــه‌لای بۆكـــان و تـــورجـــانی
هــه‌وایێكــی بـلـنـدت كـه‌وته سـه‌ر بـابۆی بـرۆم، ئـه‌مجار
گـه‌رای، سـوورایـه‌وه كـه‌ركوك و هــه‌ولێر و سـوله‌یمانی
له پـه‌ر ته‌نپه‌روه‌ریی شه‌ش مانگ له هیچ‌لایه نه‌بوی ساكـن
بـه‌لێ كـه‌ركوك و هــه‌ولێر گـه‌رمه نـاخۆشـه سـوله‌یمانی
هه‌وای ئاو و هه‌وای شاری سنه‌ت كه‌وته خـه‌یال و چـوی
به سه‌ت زه‌حمه‌ت كه دامه‌زرای له حوجره‌ی دارولێحسانی
له پاش دو رۆژ كه سوورت خوارد له ده‌وری شار و باغاتی
كه چاوت كـه‌وت بـه مـزگه‌وت و بـه بـازار و بـه دوكـانی
وتت ئه‌م جێیه جێی عه‌یشه به ده‌ور و ده‌رسی قه‌ت نادەم
ســه‌فای ئـــاویده‌ر و كـــانی شـــه‌فا و بـــاغ و گـــولستانی
شه‌و و رۆژ كوچه گه‌ردی و چایی خواردن كار و پیشه‌ت بوو
له ســـه‌ر حــه‌وزان و بـاغان چـه‌پله‌ریزان و غـه‌زه‌لخوانـی
له بـه‌ر تـه‌عنه‌ی ره‌فـیق و هـاوسه‌ر و بـاب و بـراو جـیران
ئیجازه و كاغه‌زت وه‌رگرت له پاش عـومرێكـی تـوولانی
كه ده‌ركه‌وتی، وه‌رێ كه‌وتی بـه‌ره‌و مـال مـوژده‌یان هـێنـا
بـــــیحه‌مدیللا مـــه‌لامان هـــاته‌وه دایكـم بـــه قـــوربانی
له ئاغا و نـۆكـه‌ر و پـیر و جـه‌وان، بـێمـال و ده‌وله‌تـمه‌ند
بـــه ئـــیستیقباله‌وه ده‌رچـــون له دێ، ژن هـــاتنه ســه‌ربانی

سـلاوات لێدرا، شـەربەت خـورا، شـادی کـرا نـەمجار
مـەلامان پـیاوی چـاکـە زوو دەنـاسین رێی مـوسولمـانی
عەبای نایین لە لای ئاغاوە بـۆت هـات و مـوعەیـیەن بـو
بەرات و ئاش و خانو، موچەو و جێ جووت بە تـەرخـانی
کە جێی خۆت گرت و دامەزرای و نەختێ ئیحتیرامت بو
بە جێت هێشت مینبەر و میحراب و ئەحکاماتی قـورئـانی
لە ئـەبوابـی قـەزاو دەعـوا، لە جـەرح و تـەزکیەی شـاهید
بلا بـۆچـی عـیبادەت شـەرت و روکـنی جـومعە نـازانـی
وەتـاغت کـردە مـەنزل لای سـەروی ئـاغاوە دانـیشتی
بە چۆکدا هاتی وەک بـولبول بـە قـەووالی و زمـان پـانی
ئیتر ئینسافە تاکەی رەحمی خێرێکـیش بـەخۆت نـاکـەی
هـەتاکـەی تـالیبی دنـیا، رفـیقی نـەفس و شـەیتانی
سەر و ریش و سمێلت پاک سپی بوون و ددانت کـەوت
سەری بێمەغز و دەستی لەرز و بـالای خـوار و گـۆچـانی
تەمای چیت مـاوە بـەو گـوێچکـەی گـران و چـاوی نـابینا
ئـیتر تـاکـەی بـە غـەفلەت هـەر وەکـو تـفلی دەبسـتانی
ئـەوێستاش تـاکـو ماوی تـا نـەمردوی چـارەسازێ کـە
چرای خێرات و تاعەت هـەلکـە بـۆنـێو قـەبری زولمـانی
لە کـرداری خـراپ و قـەولی بـێ مـەعنی پـەشیمان بـە
دەخـیلت بـم لە پـاش مـردن بـە کـار نـایە پـەشیمانی
لە بـەر قـاپی خـودا راوەسـتە عـەفوی لێ تـەمەنناکـە
بـە سۆزی سینەو و جـەرگی کـەباب و ئـەشکی بـارانـی

له بەر دەرکی خودا کەس ناهومێد و بێ نەسیب نابێ
مەلێ جورم و گوناهم زۆرە مەئیوسم لە ئێحسانی
خوداوەندا بەحەققی زاتی بێچون و سیفاتی خۆت
بە تەورات و بە ئینجیل و بە ئێعجازاتی قورئانی
بە عەرش و کورسی و لەوح و بەهشت و جەننەتولمەئوا
بە تەسبیح و بە تەهلیل و سجودی خەیلی رووحانی
بە حەققی ئادم و شیس و شوعەیب و نوح و ئیبراهیم
بە زولکیفل و مەسیحاو و کەلیم و پیری کەنعانی
بە تاقی دو برۆی سەردار و سەرحەلقەی رەسولانت
بە ئەهل و بەیت و ئەسحاب و رەفیق و دوست و خوێشانی
بە سیدقی حەزرەتی سیددیق و عەدلی حەزرەتی فارووق
بە زوهدی حەزرەتی حەیدەر، بەزیننورەینی عوسمانی
بە ئەخلاقی حەسەن، خوێنی حوسێن و باقی مەزلومان
بە نەوحەی فاتیمەی زەهرا لەگەل فرمێسکی چاوانی
بە نووری پاکی زەینولعابدین و باقر و جەعفەر
بە مووسای کازم و سەبری رەزا، شاهی خۆراسانی
بە ئیخلاسی تەقیی و هەم نەقی ئەمجار نەجاتم بێ
لە دەست مەکر و فەسادی نەفس و تەسویلاتی شەیتانی
بە حەققی عەسکەریی و مەهدی، بە حەققی قاسم و سەلمان
بە حەققی عەشقی شاهی بایەزید و پیری کەنعانی
بە حەقی بوعەلی و یۆسف، بە عەبدولخالەق و عارف
بە حەققی خواجەیی رامتینی و پیری عەزیزانی

بــه حـــەققی خــواجــه بــابای ســەماسیی و ئــەمیر ســەیید
بە عیززی شای نەقشبەند و بە قــوربــی غــەوسی گــەیلانی
بـە حـەققی شـاهی عـەتتار و بـە یـەعقوب و عـوبەیدیللا
بــە حـــەققی زاهــید و دەروێش و بـاقی قـوتبی رەبـبانی
بە حەققی عورووەتولوسقا، بـە سـەیفوددین و سـەیدنوور
بـــە ئــەتواری حـــەبیبوللا و مـــەزهەر، جـــانی جـــانانی
بە حەققی شاهی دێهلی، نووری سینەی حـەزرەتی خـالید
بـــە ســـاداتـــی کـــیرامـــی نـــەهریە و پـیرانـی عـوسمانی
زلیـــل و بـــێکــەسم کــەوتوم لە بـەردەرکی خــودایـی تـۆ
گـــوناهم زۆرە بـــمبەخشە خـــوداوەنـــدێکـــی مـــەننانی
بۆ خۆت فەرمووتە پەردەی عەیبیکەس هەلناگرم یـارەب
بـــپۆشـــە عـــەیبی ئـــەم بـێچـارە تـۆ سـەتتاری عـەیبانی
بۆ خـوت فـەرمووتە غـەففاری زنـوبی ئـەهلی عـێســیانم
ئـەمن تـۆبـە، ئـە تـۆ بـمبەخشە، بـەخشەندەی گـوناهانی
بــە قـــوربـــی قـــابەقەوسەینی رەســـولانت بگـــە فـــریام
لە وەخـــتی نـــەزعدا مـــەرگێ بـــە ئـــیمان و بـــە ئـاسانی
خەجالەت باری قەبر و حەشر و مـیزانـم نـەکـەی یـارەب
لە دنـیا و ئـاخیرەت هـەر تـۆ خـوداوەنـدێکـی رەحـمانی
لەسفرەی نێعمەتی خۆت (جەوهەریی) بێبەش نەکەی یارەب
کەریمو موحسینو موعتی، وەدودو سـاحیب ئـێحسـانی

## « شینی وەتەن »

دەمێکە ڕۆژ و شەو کـارم دەمـادەم زاریـی‌یە و شـینە
سەر و بەرگم لە هیجرانی وەتەن سەر تا بە پـێ شـینە
نەخۆشن میللەتی ئـێران، تـەبیبی دەولەتـیش نـاشی
نەتیجەی ئینتیزاریش بۆ خۆشی میللەت نەخۆشـینە
هەموو یاران لە بێکـاری دەکـەن تـیکراری بـێعـاری
وەلێ تیکرار و کاری من هـەمووی یـاسینە یـا شـینە
شەراب و شاهید و شەمعم لە شەودا شوعلەیی ئاهە
شهودم عادیلە شـێعـرم کـە ئـاخریان هـەموو شـینە
دەجۆشم هەر وەکوو قازان دەڕێژم ئەشکی وەک باران
نەماوە جۆشش و کۆشش شەوی من بۆیە جـۆشـینە
هەتا جۆشش نەکا بەحری ئیرادە و عەزمی مـەردانـە
لە لام بێ‌حاسلە ئەم قـیل و قـالە، وەخـتی کـۆشـینە
دەپۆشن چارشەوی عار و دەنۆشن جامی بـێ‌عـاریی
ئەتۆ مەردی لە بۆ پۆشاکـی تـۆ پـۆشـینی پـووشینە
لەئەشکی هەروەکوو یاقووت پیالەی چاو لەبالەب بوو
شەو و ڕۆژ کار و باری (جەوهەریی) لەم بادە نۆشینە

ئەم پارچە شیعرە و ئەوەی دواوەم لە کتێبی ( شیعری بەرهەڵستیی لە کوردستانی ئێران ) کۆکراوەی کاک مەحموود زامدار بەگیر کەوت.
کاک مەحموود نووسیویە لە سالانی ( ۱۹۴۵ ـ ۱۹۴۶ز )دا رۆژنامەیەکی ۸ لاپەڕەیی بە دوو زمانی کوردی و فارسی لە تاران پێتەختی ئێران بڵاو دەبووەوە کە نێوی ( کوهستان ) بوو وە ئەو دوو پارچە شێعرەی جەوهەری لە ژمارەی (۲۹ و ۳۶ )ی ئەو رۆژنامەیەدا بڵاو بیوونەوە.

« نیفاق و ئیختیلاف »

وا دەڵێن کوردانی ئەترافی شیمال مەردانە بوون
باوەفابوون تالیبی مێهر و وەفای بێگانە بوون
عاشق و مەفتوونی عیشوە و غەمزەکەی جانانە بوون
ئاخۆ راس بێ یاکە خەلکی تابیعی ئەفسانە بوون ؟
چاکە تێفکرین لە ئەحواڵی وەتەن
بۆچی واویران بووە ماڵی وەتەن
عیللەتی ئەسلی نیفاق و ئیختیلافی میللەتە
باعیسی ئەم ئیختلافاتە گەزافی میللەتە
ئەم هەموو بەدبەختی یە ناشی لە لافی میللەتە
چاری ئەم ناچاری یە باز ئیئتیلافی میللەتە
لەت لەتە جەرگم لە دەس ئەم میللەتە
کوت کوتە بەرگم لە دەس ئەم میللەتە
ئەو دەڵێ ئەم سوننی یە و (کافر)، بە شێخە موعتەقید
ئەم دەڵێ ئەو شیعەیە و بۆ سەبب و رەفزە موستەعید
ئەم دەڵێ ئەو زالمە و مایل بە جەور و موستەبید
ئەو دەڵێ ئەم یاغی یە، ئەم باغی یە، ئەم مونتەقید

داد لە دەس ئــــــەحوالی جــــومهالی وەتـــەن
داد لە دەس ئــــــەعمالی عــــوممالی وەتـــەن
پێشەواکانمان دەکەن هەر یەک بە نەوعێ ئیجتیهاد
ئەم دەکا لەو ئیجتیناب و ئەو دەکا لەم ئینتیقاد
ئەم دەدا نیسبەت بە کرداری ئەوی‌تر ئیرتیداد
ئەو دەکا نیسبەت بە گوفتاری ئەوی‌تر ئێستیناد
زار و بــــــێزارم لە بــــــێکـــاریی وەتـــەن
هـــــــــەمدەمی عـــــارم لە بـــیماریی وەتـــەن
ئــەم دەڵێ مـن بادەنۆشم بادەیی سەرشارە خۆم
ئــەو دەڵێ مـن تـالیبی یـارم، فـریبی یارە خۆم
ئەم دەڵێ من حیزبم و بەرتیل لە دەس ئەغیارە خۆم
ئەو دەڵێ مـن خـادیمم وا نێعمەتی دەربارە خۆم
ئــــــەم گـــــەزاف و ئــــــەم خـــــرافـــاتە چـــی‌یە ؟
بـــــــاعیسی ئــــــەم ئــــیختیلافاتە چـــی‌یە ؟
(جەوهەریی) تا قەومی ئێمە یەکدل و یەکسان نەبن
تــابیعی ئــەمری خـوداو پەیرەوی قـورئان نـەبن
تــابیعینی مــوسلیمین و حــەڵقەیی مەردان نـەبن
تــا مــوبیعی[1] . . . و ئــەمری ئـولولئەمران نـەبن
مـــــــوشکیلە ئــــەم دەردە دەرمـــانی بـــبێ
زەحـــــــمەتە ئــــەم هــیجرە پـــایانی بـــبێ

---

١ - تا موبیعی . . . لە کتێبەکەی کاک مەحموود زامداردا هەروا نووسرابوو.

لەم چەند شیعرە کە هەر تۆزەی لە دەمی یەکێکەوە وەرمگرتوە، هی غەزەلێکن کە جەوهەریی بە حاجی سەید عەبدوڵڵای شەمزینیدا هەڵکوتوە و هەر ئەوەندەی بە ولاشمی و لار و ویریی لێ ماوە

ئەرێ ئەی پیری شەمزینم
ئەرێ ئەی کۆلەکەی دینم
ئەرێ ئەی رۆحی شیرینم
خودا بمکا بە قوربانت
فەقیر و موستەمەندی تۆم
گرفتاری کەمەندی تۆم
شەو و رۆژ دڵ لەبەندی تۆم
خودا بمکا بە قوربانت
ئەتۆ ئەولادی گەیلانی
ئەتۆ شابازی شێخانی
ئەتۆ دەرمانی دەردانی
خودا بمکا بە قوربانت
بە جامی عیشقی تۆ مەستم
لە عیشقی تۆوەیە هەستم
گرفتاری سەر و دەستم
خودابمکا بە قوربانت

## « داری توو‌با »

مامۆستا مەلا محەممەدی ئەیوبی کە ئێستا لە بۆکانە کوتی بۆ خۆم لە خودالێخۆشبوو مامۆستا مەلا حەسەنی جەوهەریم بیست کوتی: سەردار ( سەرداری بۆکان[1] ) کە توو‌با خانمی خوشکی دابو بە عەبدوڵلاخانی کوڕی حاجی شێخاڵیخانی حاجی[2] لەک، بە دوای‌دا ناردم، منیش چوم. سەردار کوتی مامۆستا بۆیە زەحمەتم وەبەر داوی کە موقتەدیر[3] لە خزمەت خۆت‌دا بیەی و لە باتی من پچی سەرێک لە توو‌با خانمی خوشکم بدەی. منیش موقتەدیرم هەڵگرت و هەستاین بە جوتە سوارە رۆیین بۆ حاجی‌لەک، موقتەدیر کە هەم راسپاردەی سەردار و هەم راسپاردەی ماڵەوەش بوو بۆ لای توو‌با خانم. کە گەیشتینێ منی بەرێ کرد

---

۱ - سەرداری بۆکان : مەبەست سەردارحەمە حسێنخانی کوڕی سەردار سەیفەدینخانی کوڕی سەردار عەزیزخان فەرماندەری تەواوی هێزەکانی سەرانسەری ئێران لە سەردەمی ناسرەدین شایە.

۲ - حاجی لەک دێیەکە لە باکوری بۆکانەوە لە ناوچەی چۆمی مەجیدخان لە سەر ڕێگای بۆکان‌و میاندواوە.

۳ - موقتەدیر: نۆکەری سەرداری بۆکان بوە. لەبەر ئەوەی زۆر لە ماڵی سەرداردا دەمێنێتەوە و خزمەتکارێکی دڵسۆز و پاک دەبێ‌و جێ متمانەی دەرێ و ژوورێش بوە، سەردار بەسەرینی خۆی گوندی حەساربلاغی بە پاداشت پێداوە و کردویە بە خاوەن ملک.

بۆ وەتاغی دەرێ و بۆ خۆشی چوو بۆ وەتاغی ژووریٚ بۆ لای توبا خانم. زۆر دانیشتم موقتەدیر هەر نەهاتەوە. منیش زۆر بێ تاقەت بووم، چاوم گێڕا قوتو قەڵەمێک ( قەڵەم و دەوات ) لە سەر تاقەیەک دانرابوو. هێنامە خوارێ چوار شێعرم داناو ناردمە ژووریٚ بۆ موقتەدیر. موقتەدیر لەلای توبا خانم شێعرەکان دەخوێنێتەوە لێیان حالی نابێ. توبا خانم بێسەواد بووە بەلاٚن ژنێکی عاقڵ و زیرەک و زۆر تێگەیشتو بوو، دەست بە جێ تێ دەگا. بە موقتەدیر دەڵێ ئەوە شێعری کێیە؟ ئەویش دەڵێ شێعری ماموٚستا مەلا حەسەنی جەوهەرییە! توبا خانم دەڵێ بۆ ماموٚستا مەلاحەسەن لەکوێیە؟ موقتەدیر دەڵێ ئاخە من لە خزمەت ئەودا هاتووم. ئەوە لە وەتاغی دەرێیە! توبا خانم دەڵێ کوڕە جا چۆن کاری وات کردوە؟ ئەوت بە جێ هێشتوە و بۆ خۆت هاتوی بۆ ئێرە؟ کوڕە نامە هەستە زوو بڕۆوە خزمەتی ئابڕومان دەچێ!!

« ئەوەش شێعری داری توبا »

ئەی جەنابی موقتەدیر ئەی هەمدەمی شەوگاری دوور
بۆچ ڕەفێقی خۆت بەجێ هێشت و بە تەنیا چوویە ژوور
گەر دەڵێی تۆ ئەهلی عیلمی ئێرە جێگای تۆ نییە
خێر، لە حەق گەر لانەدەی هەر بۆ مەیە حۆر و قوسوور
داری توبا سێبەر و بەرگ و بەری هەر بۆ مەیە
هەر دەبێ من بچمە ژێری و تۆ تەماشاکەی لە دوور
تاقەتی هیجرم نییە تۆ خودا لە من دووری مەکە
یا ئەتۆ زوو بێرە دەر، یافەرموو تا منیش بێمە ژوور

« نازانم جەوهەریی ئەو سێ شێعرەی خوارەوەی لە وڵامی کێ داکوتوە؟ »

شێعری نەغز و نەسری پڕ مەغزت وەکو ئاوی حەیات
گەیینە سەر مردوی دڵم ئەحیاهو مین بەعدیل مەمات
مەزرەعەی رووحم وەکوو دەشتی حیجازێ تشـنەبو
توونیەتی لاچوو کەهاتن هەردو وەک دیجلەو فورات
مەسئەلەی مەشهوورە هـەرجـارێ دەڵێن خـۆشـە بـەهەشت
مـــوخلیسی تــۆم‌و لەدڵ دەرنــاچی تــا یــەومولمەمات

« هەناسەی وەسڵ »

بــەفری هــیجرت قــوللەیی کێوی دڵی واگـرتوم
مـەر شـەماڵی وەسـڵی تـۆ ئـەم بـەفرە بـتوێنێتـەوە
ئــاوری دووریت وەهـا جـەرگ و دڵی سـوتاندووم
مەر هەناسەی وەسڵی تۆ ئـەم ئـاورە بکـوژێنـێتـەوە

« جەوهەریی بە بۆنەی هاتنی حاجی سەید عەبدوڵڵای نەهری بۆ ساباڵاغ »
« و موکوریان ئەو چوار شێعرەی خوارەوەی کوتوە »

گوڵی گوڵزاری نەهری هاتە نێو باغ
چرای ساداتی شەمزین هاتە ساباڵاغ
موبارەک بێ قودومی حەزرەتی شێخ
شفایە بۆ نەخۆشیو قەلبی ناساغ
هومایە هاتە نێو ئێمە خودایە
لە نێو لابەی چەقەی کوند و قرەی زاغ
موسولمانان بکەن تۆبەی نەسوحی
بە قەلبێکی سەحیح و بێدرۆ و ساغ

*****

« ئەم سێ شێعرەی خوارەوە هی پارچە هەڵبەستێکی درێژی نەماوە »

ئەی نەسیمی سوبحدەم وەی شارەزای دەشت و دەرە
خۆم بەقوربانی شنەت بم هەستە زووبە وا وەرە
زۆر دەمێکە ئارەزوومە وا بنێرم قاسدێک
بۆ حوزووری خۆشەویستم بۆ سەرم تاجی سەرە
کاغەزێکت بۆ دەنووسم زۆر بە زەوق و ئاب و تاب
دەیدەمە دەستت بەلان تۆ خودا زەریفی هەلگرە

دەبیر و تەوحیدیی و مفتیزادە و جاوید هەر چواریان مەئموری ئیدارەی سجیلی ئەو دەمی بۆکان بوون. جاوید خەڵکی سنە بوە، مفتیزادە کوڕی مفتی سابلاغە، تەوحیدی زاوای دەبیری ئاغای گوندی ( سێ کانیان ) لە باکووری بۆکان بوە. دەبیر تەنیاکچێکی بوە کە داویە بە تەوحیدی. جاکاتێ دەمرێ مڵکەکەی بۆ تەوحیدی دەبێ. جەوهەریی لە تاکە شێعرێکیدا هەر چواریانی بە سەر کردوتەوە. جەوهەریی زۆر جەفەنگی و قسە خۆشیش بوە، کاتێ پێی دەڵێن قوربان ئەوە بۆچی دڵت زۆر لەلای مفتی زادەیە؟ دەڵێ ئێوە فەساتی مەکەن ئەو کوڕە مەلایە و منیش کوڕە مەلام بۆ خۆمان پێک دێین.

جەوهەریی کە لە گەڵ هەر چواریان دۆست بوە ئاوای بیر کردون:

دەبیرم هەر دەبیرە وەک زمانم زکری تەوحیدە
دلم مەشغولی مفتی زادەیە و موخلیسی جاویدە

*****

عیلم و هونەر و جەوهەری زاتیی چییە مالە
بۆ تەجرەبە بڕوانە کە سێ روبعی کەمالە (کمال)[1]

---

١ - ئەم تاکە شێعرەم لە کتێبی مێژوو و ئەدەبی کوردیی موکوریان بەرگی دووەم لاپەڕەی ١٥٥ نووسراوی خودا لێخۆشبوو میرزا برایمی ئەفخەمی وەرگرتووە. میرزابرایم دەڵێ خوداڵێخۆشبوو مامۆستا مەلاحسێنی مەجدی لە وڵامی جەوهەرییدا ئاوای کوتووە:

جەوهەریی کە ماڵی لە ئالبلاغ ( دێیەکە لە نزیک بۆکان ) دەبێ و ساڵاریش ئاغای ئەوێ بوە. لەو قەسیدەیەدا گوزەران و چۆنیەتی ژیانی شپرزەی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە. جا تەماشاکەن پیاوێ وەک جەوهەریی لە نێو ئێمەدا چۆنی لێ قەوماوە ! نە نان، نە ئاو، نە ڕۆن و نەوت، نە ئاوردو، نە هیچ ! بە زمانی بەڕۆژوەوە ئێواری بۆ بەربانگ دێتەوە ماڵێ لە باتی هەموو چێشت و خواردەمەنی یەک تەنیا گۆزەلە ئاوێکی بۆ دادەنێن. بەڕاستی پیاو شەرم دای دەگرێ.

« جحێڵی تازە زاوا »

قەسیدێک دادەنێم شێعری فەسیح و ساف و غەررا بێ
زەریف و خەندە ئاوەر وەک کتێبی ئەلف لەیلا بێ
بلند و پڕ لە مەعنی لەغز و پڕ مەغز و سروور ئاوەر
لە نێو جەرگەی قەسیدان وەک جحێڵی تازە زاوا بێ
هەچی وەزعم هەیە پاکی دەنووسم هیچی نابوێرم
هەچی دەردم هەیە پاکی دەڵێم ئەعلاج ئەدنا بێ
پەرێشانی و غەم و مەینەت لە دەورەم حەلقەیان داوە
بە عومری خۆم گومان ناکەم وەکو ئەو ساڵە قەوماوە
لە سوختی داردا سوختم لە گوێنی و دەستە چیلەشدا
هەموی سەریەک بخەی هیچی نەیێلی کورەیەک نابێ

---

ئەو تازە جەماڵە کە دەڵێ عیلم کەماڵە
تەشبیهی بە هەر سێ تەڕەفی نەقشی خەیاڵە

وەتاغم بۆتە نێو ماڵی کەسیف و پڕ گەنە و قرنوو
لەتاو کێچ تاکو ڕۆژ قەت بیست دەقیقە ڕاحەتم نابێ
لە بەر بێشوانی هاوین گایەکانم ناردە ئەو دییە
تەپالەشمان نەبوو، کەم‌بوو، بەشی بیست ڕۆژ ئەگەر مابێ
کە تەندوور دادەخەن دوکەڵ فەزای ماڵ پڕ دەکا وەک مژ
وەکو توونی حەمامێک دەرک و ڕۆچنەی پاکی گیرابێ
بە ڕۆژدا کار و جێگەم خوێندنی ئەوراد و مێحرابە
لە بەر قوولە و هەرا گوێچکەم لە قورئان خوێندنم نابێ
شەوێ دوای نوێژی خەوتنان چوم تفاق بۆ ماینەشێ بێنم
تەماشای کا دەکەم هەی‌هوو هەموی سێ باری چا ناپێ
بە ڕۆژو بووم لە بۆ ئیفتار لە مزگەوت چوومەوە ماڵێ
کوتم برسیمە چێشت و نان و چایی حازرە بابێ
لە جوابدا پێی کوتم کابانی ماڵێ چارە سازێ کە
نە قەند و چاو ڕۆنت ماوە، نەوتیش حەو درەم نابێ
لە جێی نان کوزەیەک ئاو داندرا وەک دەوری ئەسحابان
کوتم ڕەببی شوکور یا ڕەب کە تۆ نەیدەی ئەویش نابێ
خولاسە تا سەعاتێک کەوتمە نێو بەحری خەیال و خەم
خودایا چۆن دەبێ و کارم بە کێ چا بێ
سەدایە هاتە گوێم ئەی (جەوهەریی) بابەس بێ دەردی دل؟
دەبێ کاری هەموو چابێ کەسێ سالاری ئاغابێ
لە هەر دودەستی وەک هەوری بەهاریی زێڕ و زێو دەرژێ
لە بەگزادە و لە دێبوکری وەکوو ئەو پیاوە چا نابێ

« شینی حاجی شێخ عەبدولقادری نەهری کە لە گەڵ تاقمێک »
« لە خودا پەرستانی پایە بەرزی کورد بە دەستی پیسی »
« ئەتاتورکی گلاوی خوێنرێژ شەهید کران »

رەفێقان با بکەین شیوەن کە وەختی هیجری یارانە
پیالە و شوشە بشکێنین کە شادیی روی لە شێوانە
بیساتی عەیش و خۆشی هەلگرن، نۆرەی غەم و دەردە
هەمو لایە سیا پۆش بن کە تازیەی پیری مەیخانە
بڵێن ساقی لە باتی مەی پیاڵێک پڕلە خەم بێنێ
بڵێن موتریب دەف و نەی لابەرێ جا وەختی ئەفغانە
حەریفان، تاکو ئێستە بەزم و رەزم و چەپلەرێزان بوو
ئەوێستا وەختی قورپێوان و نۆبەی شین و گریانە
لە هەر لایێ کە دەتدی مەجلیسی ئاوازە خوانی بوو
لە هەر کۆشکێ دەبینی ئێستە واوەیلا و لە خۆدانە
دریغا پشتی ئیسلامێ بە جارێ تێک شکا حەیفێ
کە شای دنیا و دین یەخسیری دەستی زولمی ترکانە
شەهی شەمزین و غەوسی سانی و هانی و گەیلانی
رەواجی دینی ئەحمەد بوو چرای ئێران و تورانە
لە پاش حەفتادو چەند ساڵێ لە دیاربەکرێ بەدەست تورکان
لە گەل جەمعێ لەساداتو مشایخ بوونە نیشانە
یەزید و کەربەلا ئەورۆ کەمال پاشا و دیاربەکرە
کە ئەو سەید و مەلایەی کرد بە ناحەق تیرە بارانە

دڵم بۆ شێخ محەممەد پڕ لە زووخاوە مەکەن مەنعم
کە دو جۆگە لە خوێن جاری بکەم لەو هەردو چاوانە
کەسێ بو عالم و عابید، نەجیب و عاقل و کامیل
دەبێ هەرخاک بەسەر داکەم لەپاش ئەو شێخە نۆجوانە
لە پاش ساداتی نەهری مردنم زۆر خۆشترە لە ژیان
لە دوای ئەو خانەقا چۆلە دەبا کوێربم لە چاوانە
بناغەی دینی ئیسلامێ سەر و بن بو، و تێک روخا
لە بەر یەک هاتەدەر حەیفێ بە تۆپی زولمی ترکانە
رەفیقی ئیبنی مولجەم، یاری شومرە گەورەیی ترکان
کە قەتل و عامی کردن بێ خەتا ئەو پیاوە چاکانە
کە ئەوشێخ و مەلا و ساداتەیان هێنانە پێی ئێعدام
لە پێی سێدارە راوەستان و فەرمویان بە کوردانە
تەماشای گەردن و دار و تەنافی ئێمە کەن بەلکوو
لە دوای ئێعدامی ئێمە تۆلە بستێنن لە ترکانە
لەرێی دینی موحەممەد سەربرین زۆر فەخرە بۆئیسلام
لە مردن قەت مەترسن کوشتنی وا رەسمی پیاوانە
لەسەر رێی دین و شەرعی موستەفا قەت لامەچن کوردان
کەلامولڵا قەبول کەن چاکە نەک قانونی ترکانە
ئەوەی ترکان بە سەر ئیسلامیان هێنا بە هیچ دەورێ
نەماندی غەیری حەججاج و یەزید و شومری شەیتانە

مەلا طە قاسمی مەلای مزگەوتی بیلالی حەبەشی بۆکان کوتی خودالێخۆشبو کاکە حەمەی کوڕی حاجی حسیناغای داشاغلْ شێعری جەوهەریی زۆر لەبەر بو. حیکایەت و قسەی خۆش و قسەی جەفەنگیی ئەوی زۆر دەزانی. کاکە حەمە دەیکوت من زۆر لە خزمەت مامۆستا مەلا حەسەن دا بووم و زۆر شتی جوان و نەبیستراوم لیْ بیستوە! بەداخەوە کاکە حەمەمان لە دەست دەرچو. منیش لەو هەمو شتەی بۆی دەگێڕامەوە تەنیا دو شتم لەبیر ماوە یەکیان حیکایەتی سۆفی سالە و یەکیشیان سیْ شێعرەکە بۆ ئەوڕەحمان بەگی تیکانتەپەی کوتوە.

## «حیکایەتی سۆفی سالە»

حاجی سەید عەبدوالحکیم زەمبیل پیاوێکی دەبیْ نێوی سۆفی سالە دەبیْ سۆفی سالە جارێکیان لە گەلْ ژنەکەی لیْیان دەبیْ بە شەڕ. ژنەکەی زۆری لامجومی لە گەلْ دەکا. سۆفی سالەش زۆر تووڕە دەبیْ تەلاق دەخوا و پیی دەلیْ هەرسیْ تەلاقت کەویْ لە سەر دوتڕ و نیوێک. ژنەکەش دەلیْ ئەوە قبولم کرد. سۆفی سالە دوای تاوێک کە خاو دەبێتەوە و دێتەوە سەرخۆی، دلی دەکەوێتە غایلە و دەچیْ بۆ لای حاجی سەید عەبدوالحکیم و کارەساتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە. ئەویش بڕێکی بە سەر دادێ و دەلیْ تەلاقت کەوتوە. سۆفی سالە ئیدی قوتی لێقورمیش دەبیْ و هەلدەستیْ بەرە و تورجان ملی ریْ دەگریْ. حاجی بابەشێخ لە مالْنابیْ لە مەلاکەی لەویْ دەپرسیْ ئەویش دەلیْ تەلاقت کەوتوە. سۆفی سالە بەرەو بۆکان دێتە خواریْ لای هەر مەلایەک دەچیْ دەلیْ تەلاقت کەوتوە دێتە

بۆکان هەروای پێ دەڵێن. ئەوجا رو لە دیهاتی فەیزوڵلابەگیی دەکا، دەچێتە بەردە زەرد، ئینگی‌کەند، دەرزی وەلی هەر ئەوەیە کە بیستویەتی. دەچێتە قەڵەندەریش هەروا. لەوێوە با دەداتەوە بۆ باغچە و دەچێتە خزمەت مامۆستامەلا حەسەنی جەوهەریی و نامەی مامۆستاکانی پیشان دەدا کە هەمویان بۆیان نووسیوە تەلاقت کەوتوە. مامۆستا کە تەماشا دەکا ئەوە سۆفی ساڵە رەنگی هەڵپروچقاوەو لێوی باری گرتوە، وەک شێتی لێ هاتوە، دەڵێ ئەرێ سۆفی ساڵە دا بۆم بگێڕەوە براله بزانم چۆنت تەلاق خوارد؟ سۆفی ساڵە دەڵێ قوربان لەگەڵ ژنەکەم بە شەڕ هاتم زۆری توورە کردبوم. منیش ئاگام لە خۆم نەمابوو، کوتم هەر سێ تەلاقت کەوێ لە سەر دو تڕ و نیوێک، هەرکەسێک دو تڕ و نیو بدات، هەر سێ تەلاقت کەوێ ئەویش دەسبەجێ قەبولی کرد، مامۆستا دەڵێ سۆفی ساڵە نامەیەکت بۆ دەنووسم بیبە بۆ لای ئەو مامۆستایانەی چویەتە خزمەتیان. سۆفی ساڵەش نامە هەڵدەگرێ و بەرەو دوا دەچێتەوە لای هەر کام لە مامۆستاکان نامەکەی جەوهەریی دەبینێ دەڵێ سۆفی ساڵە مامۆستا مەلا حەسەن تەلاقەکەی بۆ چاک کردویەوە.

نامەکەی جەوهەریی ئاوا بووە :

دوای سەلام و دەست ماچ کردنی مامۆستاکان ،

دوتڕ بە هەرحال.نیو تڕ مەحاڵە
دو تڕ و نیو تڕ بە ریشی ساڵە

جەوهەریی ماڵی لە باخچە دەبێ رۆژێک بە سواریی ( سواری چارەوێ ) دەچێ بۆ تیکانتەپە بۆ دیدەنی ئەورەحمان‌بەگ. کە دەگاتە نێو دێ، خێزانی ئەورەحمان بەگ لە گەڵ نۆکەران بەرەو پیری مامۆستا دێن. مامۆستا دەڵێ ئەی ئەوە رەحمان لەکوێیە ؟ ئەویش دەڵێ قوربان چوە بۆ بۆکان. جەوهەریی دەڵێ بۆکان بۆ چوە؟ خۆ قەرار وانەبوو پچێ بۆ بۆکان! خێزانی ئەورەحمان بەگ دەڵێ قوربان نەدەچو بە زۆر بردیان بۆ بۆکان بیکەن بە رەئیسی سندوق. جەوهەریی لادەدا. دوایی سێ شێعر دادەنێ و بۆ ئەورەحمان‌بەگی بە جێ دێڵێ. ئەورەحمان‌بەگ دێتەوە، میوانێکی زۆری لە گەڵ دەبێ، دەپرسێ لەو ماوەیە کە من لە ماڵ نەبووم، میوانێ کەسێک، نەهاتوە؟ دەڵێن بەڵێ مامۆستا مەلا حەسەن تەشریفی هێنا. دەڵێ ئەی هیچی نەفەرموو؟ قاقەزێ، شتێکی نەنووسی؟ یەکێ لە پیاوەکانی دەڵێ! بەڵێ سێ شێعری بۆ تۆ نووسیوە. ئەویش دەڵێ بیخوێنەوە. دەڵێ بۆ تۆی نووسیوە. دەڵێ باشە بیخوێنەوە. پیاوەکەی ئەورەحمان بەگ دەڵێ ئاخر هەر بۆ خۆتی نووسیوە. ئەویش دەڵێ ئاخر قەی ناکا! جنێوی نەداوە بە من بیخوێنەوە! کابراش شێعرەکان دەخوێنێتەوە. ئەورەحمان بەگ دو شێعری هەوەڵی پێ خۆش دەبێ. بەڵام شێعری ئاخری کە دەخوێنێتەوە دەڵێ ئەوە چییە مەلا حەسەن لە ئاخریدا هەر تێکی دەدا.

ئەو سێ شێعرە شێعری نێوە راستیان هەر دو لەتەکەی لەنگە. نەمتوانی بیهێنمەوە سەر راستە.

تەشەککور واجبە بەهـ بەهـ کەجێی فەخر و موباهاتە
دەڵێن شاهم لە بۆکانە رەئیسی ئینتیخاباتە
بە بێ دەستووری ئەو زاتە رەئی بدەی نابێ
لە قانونی حەپەقدا جزات سزاواتە ؟؟؟
ئەگەر دەورەی عەدالەت بێ رەئیس قەت پیاوی کەر نابێ
هەمووشت بۆتە کەر بازار و مەجلیسیش خەرافاتە

« جەوهەریی توو‌تنی نامێنێ دەنێری بۆ لای خەلیفە سەید خدری »
« داشاغل بەم شێعرانە داوای توو‌تنی لێ دەکا »

ئـەی جـەنابی مـوستەتاب سـەیدی عـالی نـەسەب
ئـەی مـوریدی قـادریی و غـەوسی گـەیلانی نـەسەب
ئـەورۆ دو رۆژە لە مـالێ نـۆبـەتی مـیهمانمە
فـەرموو بـا دەرچـێ لە مـالم کـافری دێوی لامـەزەب
بـۆ دەوای ئـەم نـۆبـەتێـە تـوتنێکم لێت دەوێ
نەرم و خۆش و زرد و جوان، تای نـەبێتـو مـونتەخەب

*****

لە جـێژنێکدا جـەعفەراغـای کـەریمی ئـاغای تـوونقەلا ووتـار دەدا و جەوهەریش لەوێ دەبـێ. دوای قسـەکـان جـەوهەریی هـەر لەوێ ئـەو چوارینـەی خـوارەوە دەهـۆنێتەوە و دەینـێرێ بـۆ کـەریمی و ئـەویش چاکەیکی زۆری لەگەڵ دەکا. لێرەدا جەوهەریی تاقانەیی خۆی رادەگەیەنێ و قسەزانی کەریمی پێدا هەڵدەکێشێ.

وەمـدەزانـی هـەر ئـەمن سـاحیب وجـود و جـەوهەرم
بـۆخـەتابەت دەست و داوێن پـرلە لەعـل و گـەوهەرم
تـا لە جـێژنێدا کـەریمی هـاتە سـەر نـوتق و خـیتاب
بۆم موسەللەم بوو کە من شـاگـردی ئـاغای جـەعفەرم

« ڕەزاشا گۆچانێک بە خەڵات دەنێرێ بۆ حاجی بابەشێخی جەمیان و »
« جەوهەریش پیرۆزبایی پێدەڵێ »

ڕۆژی جێژن و شادی‌یە یاران وەرن باکۆوە بین
زاهید و سۆفی وەدەرنێین گوی نەدەینە واعیزین
موتریب و ساقی بلا بێن دەست بە تار و جامی مەی
بۆ تەماشا بێن بە لەنجە دلبەرانی نازەنین
سونبول و ڕێحانە و گولناز و شەوبۆ و سوورەگول
خال و پەرچەمیان وەدەرخەن خونچە بێنە پێکەنین
سەرو و شمشاد و چنار و نەخل و نار و ناروەن
رابوەستن، ببنە خزمەتکار، لالە و یاسەمین
هەوری ڕەحمەت با بباریێ لە سەر گولزار و باغ
بای سەبا با بێنێ بێنی ڕەولەیی خولدی بەرین
سەف بە سەف غیلمان بلا بێن دەست بە تار و جامی مەی
دەستە دەستە بۆ نەوا و خونیاگەریی بێن حۆرعین
تاق و جووتی تاق بە تاقم بچنە پێشوازی خەلات
وا ئەمیر هێنای لە لای شاهەنشەهی ئێران زەمین
واریسی تەختی کەیان سولتان ڕەزاشای پەهلەوی
سێبەری ئەمن و ئەمان و ساحیبی تەخت و نگین
یەکسەدا و ئاوازە بادەستی دوعا پێشی خودا
بۆ دەوامی دەولەت و عومری شەهەنشا راگرین

وا عەسایێکی مورەسسەع پڕ جەواهێر ناردی بۆ
حاجی باباشێخی[1] جەمیان[2] نەسلی خەیرولمورسەلین
ساحێبی سەیف و قەڵەم حاجیی و غازی و پێشەوا
ساحێبی شەرع و تەریقی موقتەدای موتەقین
ئەو عەسایە بۆ شکستی حاسیدانی ئەو بلێ
وەک عەسای مووسایە یەعنی تیلکە سەعبانونموبین
سەت هەزار جارت موبارەک بێ خەلاتی پادشا
ئەویەدی بەیزاو عەسایە هەردو ئایاتی مەتین
بۆ نیساری ئەو خەڵاتە من کە دەستم خاڵییە
روحی خۆم هێناوە فەرمو ئەی رەئیسولعاریفین
بۆ عوموم ئەورۆ کە جەمیان مەلجەئو دارولئومید
خاسە بۆ تۆ (جەوهەریی) حەمدەن لیررەبیلعالەمین

---

١ - خودالێخۆشبو حاجی باباشێخ کە مامۆستایەکی بەرز و زانایەکی گەورە بوە، هەوەڵ ماڵی لە جەمیان بوە پاشان ماڵی چۆتە تورجان.

٢ - دێیەکە لە باشووری بۆکانەوە کە جێگای بنەماڵەی شێخانی زەمبیلە.

جەوهەریی لە گەڵ سەلیمخانی تیکانتەپە دەچن بۆ باغچە بۆ دیدەنی سەعید خانی ئەدهەمی و دەشیەوێ لەوێ جێ بخوازێتەوە و ماڵی بچێتە باغچە. بەڵام کە دەچن سەعیدخان لە ماڵ نابێ و لە کرکرە دەبێ. جەوهەریش ئەو سێ شێعرەی خوارەوەی بۆ دەنووسێ:

جەنابی ئەدهەمی ئەورۆ لە گەڵ ئاغای سەلیمخانی
بە جووت هاتوینە باغچەی تۆ بەرەسمی دیدومیهمانی
بە بێ تۆ باغچە بێ سەیر و سەفایە، دل لە غەمدایە
لە فەیزی مەقدەمت شادمان بکە تۆ غەوسی گەیلانی
ئەگەرچی جەوهەریی پیرە لە جەمعی ئێوەدا بەلکو
شەوقێکی تازەی بێتە سەر وەکو ئەو پیری سەنعانی؟

## « ئاشی جامەرد[1] »

جـەوهەریی سـالی ١٣٢٢ی هـەتاوی لە دێی جـامەرد مـەلا دەبـێ. قاسماغای جامەرد رۆژێک بە مامۆستا دەڵێ قوربان خەیالم هەیە ئاشێک دروست کەم کە لەو نێوەدا تاق بێ لۆتف بفەرموو نامەیەک لە زمانی منەوە بنووسە بۆ وەستا ئەحمەدی ئەللامرادیی کە یەکجار وەستایەکی قابیل و سەردەرچووە، با بێ ئەو ئاشەمان بۆ دروست کا، ئەگەر نامەکەی بە شێعر بۆ بنووسی زۆری پێخۆش دەبێ و زوو بە دەنگمانەوە دێ. مامۆستاش لە بەرواری ١٣٢٢/٣/١٨ نامەیەک بە هەڵبەست دەنووسی بۆ وەستا ئەحمەد کە بێ بۆ جامەرد. وەستا ئەحمەدیش دێ بۆ جامەرد و ئاشەکە دروست ئەکا. من (نووسەر) کە خەڵکی جامەردم زۆرم ئەو ئاشە دیبوو. ئاشێکی تا بلێی خێراو بە نێو بانگ بوو. ئاشێر لێ وەرەز نەدەبوو ئەو ئاشە لە رۆژهەلاتی جامەردەوە لە مووچەیەک بە نێوی دواوان (دووئاوان) دروست کرابوو جا بۆیە نێوبانگی بە ئاشی دواوان رۆیی بوو، لە دوو قوڵەوە (دیوی بەر رۆژ و دیوی نسار) ئاوێکی زۆری بۆ دەچوو. ئێستاش ئاسەواری ماوە. کاتێ وەستا ئەحمەد کۆچی دوایی دەکا نامەکەی جەوهەریی دەکەوێتە لای وەستا شوکرەی کوڕی وەستا ئەحمەد کە ئێستا ماوە و لە بۆکانە. چوومەلای و داوام لێ کرد. ئەویش بە پێخۆشبوونەوە شێعرەکانی بۆ نووسیمەوە و پێی دام کە منیش ئەوە پێشکەش بە خوێنەرانی بەڕێزم کرد.

---

١ - جامەرد دێیەکە لە ٢٥ کیلومیتریی رۆژهەلاتی بۆکان لە سەر جادەی سایانقەلاو بۆکانە.

ئـــوستادی دانـــا مـــیرزای خــۆش ئـــەخلاق
بـــە عـــیلم و ســـەنعەت مـــەشهووری ئـــافاق
وەســـتـــا ئـــــەحمەدی ئـــەللا مــــرادی
نـــێوت رۆیشـــــتوە وادی بــــــە وادی
ئـــەتۆ شـــەخسێکـــی رەنـــد و جـــەوانـــمەرد
زەحـــمەت قـــەبول کـــە تـــاکـــو جـــەوانـــمەرد
تـــــەمامە ئـــــاشێک لە نـــوێ بـــیناکـــەم
بـــە شـــێعـــری کـــوردی بـــا بـــۆت تـــەواو کـــەم
دوو جـــــۆگـــــەی بـــبێ بـــەر رۆژ و نســـار
نـــە مـــەندو نـــە خـــور تـــەراز و هـــەموار
ســـــەرەنیای[1] تـــەراز مـــەند و بـــە مـــیزان
بـــە راســـتە وگـــونیا وەک حـــەوزی بـــۆکـــان[2]

---

١ - سەرەنیا : حەواڵە . ئەو دیوار و بەردە چنەی دۆڵەکەی پێوە هەڵسپێراوە.
٢ - حەوزی بۆکان بە حەوزە گەورەی بۆکان بەناوبانگە. لەمێژە ئەو حەوزە هەیە و لە بن قەڵای سەرداردا هەڵکەوتووە تا ئێستا ئاوی خواردنەوەی خەڵکی بۆکان لەو حەوزە بووە، تا سەری نەگیرابوو، دیمەنی جوانی، بۆکانی خۆش کردبوو. تەنانەت ببوە هەوێنی گۆرانی و شیعری هۆنەران. حەسەن زیرەکی نەمر دەڵێ :

حەوزەکەی بۆکان قووڵ و بێ بنە
دوو ماسی تێدا خاڵ لە گەردنە
لەو جووتە خوشکە یەکیان هی منە

دۆڵـــــــی[1] داریبـــــێ ساف و بــــێ گـــری
هـــێنـــده لەبـــار بــــێ دەســـتی لێ نـــەدری
زەمــــبورەی[2] گـــەورە ســـاف و مـــوددەوەر
کـــیسەڵبـــێ زەحـــمەت پــێی دا بــێتـــەدەر
ئـــاشێک بـــێ سەخرە ڕێی پــێ نـــەبردبێ
بـــینای وا عـــالی هـــیچ کەس نـــەی کـــردبێ

---

هۆنەری پایە بەرز و تاقانە مامۆستا هەژار دەفەرمووێ
بەس خەوالو بە خەیاڵ بڕوانە...
شاری بۆکان وەکوو بوکان جوانە

..........

ئاوی چاوێک لە دڵی ئەودایە
چاوی قرژاڵی لە بەر هەڵنایە

١ - دۆڵ : دارێکی زۆر ئەستووری درێژ بوو کە نێوەکەیان هەڵدەن وەکو لۆریان دەکرد. پاشان بە بزمار و تەختەی ڕێک و ساف لاهەڵدڕاوەکەیان دەگرت و کونبڕیان دەکرد بۆ ئەوەی ئاوبە دولەکەدا بڕواتە خوارێ و لە نێوان تەختە کانەوە نەیەتە دەرێ و فیشقە نەکا. لای خواری دۆڵەکەیان هەڵنەدەدڕی، بەڵکو نێوەکەیان دەر دێناو لەڕوکاری تەختەکانەوە نزیک بە ژێری دۆڵەکونیان دەکرد بۆ جێی زەمبوورە .

١ـ زەمبوورە : لوولە دارێکی باریکە، نزیکەی بیست سی سانتێک درێژە و لەکونی دۆڵەکیان دەترنجاند و بە هۆرەو پواز توندیان دەکردە تائاوەکە بە پاڵەستۆیەکی زۆرەوە بێتە دەرێ .

بـــــەردە ئــــاشەکـــەی حـــەوبست و[1] گـــێر بـــێ
گـــــرمە و زرمـــــەکـــەی وەک نـــەڕرە شـــێر بـــێ
گــــەنم بکـــا بــــە ئـــارد ڕۆژێ سێـــی تـــەغار
گـــــرمە گـــرمی بـــــێ وەک هـــەوری بـــەهار
چـــــەقەنەی[2] وابــــــێ لە هـــــاتنی دانــــدا
نـــــەزیری نــــــەبێ لە ڕوی دنــــــیا دا
ئــــــالەم تـــــاریفە هــــیچی کـــەم نـــەبێ
خـــەڵاتت دەکـــەم ئـــەگـــەر ئـــاوا بــــێ
تـــەوەرەو[3] بســـــتەو[4] پـــەرەو[5] تـــۆپـــەکـــەی[6]
ژێر دوزەقـــەو[7] ئــــاو، مـــووروە[8]ســـەنگەکـــەی

---

۲ - ئاشی حەوبست و گێر بە ئاشێکیان دەکوت کە بەرینانی بەر داشەکەی حەوت بست بوایە. کونی بەرداشەکەش بۆ خۆی نزیکەی بستێک دەبو. جابە بەرداشێکی ئاوایان دەکوت حەوت‌بست و گێرە ئاشی حەوبست و گێریش لەبەر ئەوەی ئاوی زۆر دەویست لەهەمو جێ‌یەک دروست نەدەکرا بەڵکو لە جێگایەک دروست دەکرا کە دو سێ ئاشگێر ئاوی پێدا بهاتبایە. جا ئاشێکی ئاوا چونکە شەو و ڕۆژ زۆری دادینا و خێرابوو وەئاشێری زوو بە ڕێ دەکرد لە دوور و نزیکەوە بۆی دەهاتن و ڕمێنی زۆر دەبوە (کونی بەرداش = گێر)
۲ - چەقەنە: دارێکە سەرێکی پانە و دەکەوێتە سەربەر داشەکە و بە گەڕانی بەر داشەکە ئەویش هەڵدەبەزێتەوە و پلووسکی گەنمەکە دەلەرێنێتەوە تا دانی ئاشەکە بە ئاسانی بێتە خوارێ.
۳ - تەوەرە: ئاسنێکی پان بوو، نزیکەی بیست سانتیش درێژ. لە دوو سەرەوە پانیان دەکردەوە، وەک دەمە تەور، نیوەڕاستەکەی باریکتربوو کونێکی

هـــــــــەموی ریک و پـــــێک، راست و مـــــونەززەم
هـــــیچ نـــــەقسی نـــــەبێ نـــــە زۆر و نـــــە کـــــەم

---

دریژاودریژیان تیٚ دەکرد کە سەری بستەکەی تیوە دەچو، لەوبەرەوبەری کونی بەرداشەکە، بە قەد تەوەرەکە نەپەلترو نەقوولتر، دایان دەبری و بۆیان دەکرد بە قەبر. بە جۆریک کە نیوەراستی تەورەکە بکەوتایەتە نیوەراستی کونی بەرداشەکە.

۴ - بست یان بستە : ئاسنیکی دریژی چوار پالو بوو کە دەکرا بە کونی تۆپە ئاشەکەداو سەری خوارەوەی دەچوە سەر مووروەسەنگ و سەری سەرەوەشی دەچوە نیو کونی تەوەرەکەوەو کاتیٚ ئاو بە توندی لە پەری تۆپەکەی دەدا دەخولاوەو بەرداشەکەی هەلدەسووراند .

۵ - پەرە : بەو تەختە دارانەیان دەکوت کە لە قەدی تۆپەکیان دەچەقاند، بۆ ئەوەی ئاوەکە، کە بە توندیی لە زەمبوورەکەوە دەهاتە دەریٚ، لەوانیداو تۆپەکە بخولینیتەوەو ئاشەکە هەلسووریٚ. هەر وەک پەرەی باوەشین .

۶ - تۆپ : داریکی ئەستووری سی چل سانت کە نیوەکەیان کون دەکرد و بستەکەیان پیدا دەکرد و لە رووکاری دەرەوەش پەرەکانیان تیٚ دەچەقاند.

۷ - دۆزەقە: جیگایەک بوو لە بن ئاشدا، وەک پرد دروست دەکرا، کە سەری خوارەوەی دۆلەکە دەهاتە نیو ئەوەوە. بستە و تۆپەکەش لە بەر ئەوەوە دادەمەزرا، جا کاتیٚ ئاو بە توندیی لە زەمبوورەکەوە دەهاتە دەریٚو لە پەرەی تۆپەکەی دەدا، تۆپەکە بە توندیی هەلدەسوورا و ئاوەکە وەک تۆزی لیدەهات و لە دۆزەقەکەوە دەهاتە دەریٚ.

۸ - مووروەسەنگ: بەردیکی شینی خری رەقی لوسە کەیا هەر بۆ خۆی لایەکی کەمی قوولە، وەیا بریک قوولی دەکەن و نووکی بستەکەی دەنینە سەرو لە سەرداری پیٚ دایدەبەستن و بستەکەی لە سەر دەخولیتەوە. بەردەکە نەدەسویٚ و نەدەخوریتەوە.

(دوشیعری لێرەدا جەوهەری بە سەردا رژاوە و ناخوێندرێتەوە)

لە قــــەولی ئــــاغاوە مــــن عــــەرزت دەکــــەم
حــــەسەنی (جــــەوهەریی) مــــەلای دێیەکــەم

کاتێ جەوهەریی مالی لە جامەرد دەڕوا، دوای ئەو مەلا مەحەمەدی جامی کە بە مەلا دوودوو بەنێو بانگ دەبێ، مالی دێ بۆ جامەرد و دەبێتە مەلای ئەوێ. جەوهەریی ئەو چوارینەی بەو بۆنەوە کوتوە.

هــــەتا شــــاری جــــامەرد بــــوو یــــەک مــــەلا بــــوو
ئــــەوێســــتاکــــە مــــەلاکــــەی بــــۆتــــە دوو دوو
جــــەنــــابێ قــــاسماغا پــــــایەدار بــــێ
بــــە دوی دێ ســــێ، دوو دێنــــە ســــەر دوو

جەوهەریی مالی لە باغچە دەبێ جارێک برێک سەری دێشی و گیانی دادەگیرێ. بە سەلیمخانی ئەوێ دەلێ ئەرێ سەلیمخان حوب و دەرمانی سەرێشەت هەیە؟ ئەویش دەلێ قوربان من نیمە، بەلان حەمەدەمین بەگی تیکانتەپە هەیەتی و بە شێعریشی دەدا. ماموستاش دەست بە جێ ئەو سێ شێعرەی خوارەوە دەهۆنێتەوە و بە پیاوێکدا دەی نێرن بۆلای حەمەدەمین بەگ و ئەویش دەرمانی بۆ دەنێری (ئەوکاتە بە حوب و قورسیان کوتوە شەکولات).

جــەنابی کــاکــەمین دایــم دۆعــا گــۆی بــەژن و بــالاتــم
بە عێلی حاجی ســەرتیپە[1] هــەموو فــەخر و مــوباهاتم

---

١ - حاجی سەرتیپ: حاجی سەلیمخانی کوڕی فەیزوللابەگە کە دەبێتە بابی حەمەدەمین بەگ.

سەرم نەختێ گرانە، سەر دڵم قورسە، دەمم وشکە
منیش زۆر ترسەنۆکم دایمەن غەرقی خەیالاتم
ھەتا دەستم دەگاتە شار و بازارو حەکیمی چاک
ئەگەر ماوە لەلات موحتاجی دودانە شەکۆلاتم

سەلیمخانی باغچە برای سەعیدخانی ئەدھەمی بۆنەی ئەو سێ شێعرەی خوارەوەی بە خەتی خۆی بە فارسی لە نێو بەیازەکەی سەعیدخاندا ئاوا نوسیوە! در تاریخ ھزار و سیصد و ھفتاد اطاق اندرون را سفیدکاری می‌کردم بعداز تمام شدن سفید کاری جناب ملاحسن به اندرون آمدند و این سه شعر را سرودند

موبارەک بێ وەتاغی بەرز و جوانت
ھەمیشە ئاوەدان بێ دەرک و بانت
بە شادی و عیزەت و دەولەت بمێنی
سەلامەت بن ھەمو ئەولادەکانت
ھەزار و سێسەت و حەفتا تەواو بوو
سپی کاریی وەتاغی خانومانت[1]

---

١ - خانومان : خانمان، خانمەکان.

جەوهەریی بە زریاندا نامە دەنووسێ بۆ سەعیدخانی ئەدهەمی باغچە لە ئۆردوی نەڵێنی فەقێ ئیسی یان.

زریـــانە شـێتـــە ســـەری مـــن فـــیدای شـــنە شـــنت
قـــــوربانی تـــۆزی ڕێگـــــەتم ئـــــەمجارە واوەرە
کـــــالان دەپـێکـــە بـــۆنـــەڵێنـــی[1] فـــەقێ ئـــیسیان
ئـــــۆردو[2] لەوێـیـــە خـــێوەتـــە، خـــەرگایە چـــادرە

---

١ - نەڵێن: مەلاعەبدوڵلای خەلیفەزادە کوتی نـەڵێن، نـاوچەیەکـە لە نـێوان پیرانشار و سەردەشتدا کە چۆمی کەلکوێ لەتی کـردوە، لەتـێکی کـەوتۆتە باکووری کەلکوێ و لەتـەکـەی دیکـەشی کـەوتۆتە بـاشووریەوە. بـەشی باشووری هی مەنگوڕ بوە، بەشی باکووریش هی گەورک، بە نەڵێن گـەورک، نەڵێنی فەقێ ئیسیشیان پێ دەکوت چونکە لە هەوەڵەوە ئەو نەڵێنە هی هۆزی فەقێ ئیسی بوو کە بە هۆی بێهێزیەوە گەورک بە زۆر لە دەستیان دەرهێنان و لێیان داگیر کردن.

٢ - عەبدوڵلا خانی یەزدانپـەنا کـە خـۆشی فـەیزوڵلابەگـی یە کـوتی ئـەو ئۆردوە، ئـۆردوی فـەیزوڵلابەگـی یان بـوو. دەوڵـەت بـردبوونی بـۆ شـەڕی مەلاخەلیل کە دژی ڕەزاشا ڕاپەڕیبوو. خوێنەری بەڕێز، بۆ ناسینی مەلاخەلیل و ڕاپەڕینەکەی تەمەشای کتێبی (قیام ملاخلیل) نووسراوی خودالێخۆشبوو میرزا برایمی ئەفخەمی بکە.

جـــەممن لەوێ هـــەموو عـــێلاتـــی مـــوکریان
ئـــەو دەشـــتە پــڕ لە نـــۆکـــەرو ئــاغاو بـــەگـلەرە
بــیستومە چــۆلە ڕێگــەش بــڕێک بــێ زەخــیرەیە
بــڕسیت نــەبێ هــەتا دەتــوانــی تــۆشــە هـەلگـرە
تــۆراغ و قــەند و چــایی ئــەوەند تــا دەگــەیە وێ
نـــان و کـــولێرە چـــەورەو پـــەنیر و کـــەرەش بـــەرە
ڕێگـەش بـڕێک بـە تـرسە نـەوەک تـوشی کـێشـە بـی
خــەنجەر وەبــەر چـەقێنـەو دەمـانچەو تـفەنگ بـەرە
ئـــەو دەســـتە پـــاکـــەتە بـــنێ گـــیرفانی بـــاخەلت
دەســـرێکـــی تـــێوە پـــێچـــەو زۆر جـوانـــی هـەلگـرە
نـــووسیومە بـــۆ حـــوزوری ســەعیدخانی ئــەدەمی
ران و ڕکـــێفـــی جـــوانــە، تــیغی دەبـانە مـجەوهەرە
تــەعریف نــاکــرێ بـــە قــەلەم چـــۆن تـەواو دەبــێ
مـــیرزایـــــە، ســـواری چـــاکـــە، ڕەشـــیدە، دلاوەرە
ئـــەووەل بـــــڕۆ هـــــەتاوەکـــو نـــزیک خـــێوەتـــان
کــانی‌یەکـــی لێـــیــە ئــاوی وەکــوو ئــاوی کــەوسەرە
دەوری گـــــولۆکــــە پــاکـــی هـــەلالە و وەنـــەوشەیە
گــیا خـــاوە، ســـوێســـنە، مـــەندێـــیە، شـــەستپەرە
دانـــــیشە دەست و دەم و چــــاوی خـــۆت بشـــۆ
خــاوێن لە تـــۆزی ڕێگـــە و دەســـتنوێژێ هـــەلگـرە

ئـەمجارە هـەستە نـەختێ لەسـەر گـردی خێوەتـان
راوێسـتـە تـاکـوو سـەعـاتێ سـەبر گـرە
چـاوت بگـێـرە تـاکـو دێنـە دەرێ نـۆکـەر و غـولام
جـانگیر و مستەفا و عـەلی بـانگکە ئـەو سـەرە
دەست تـێکگـرن، قـەدرێ هـەڵپـەرن بـلێ بـلێ
تۆخـودا عـەلی بـە یـادی رەسـوول چـاکـی هـەلگـرە
تـێکـرا بـرۆنـە خـوارێ بـەلنگدان و پـێکـەنین
تـا دەچـنـە بـەردەمـی ئـەو گـەورە چـادرە
ئـەووەل بـچۆرە خـێوەتـی سـەرتیپی شـاریکەند
قـوبەی هـەمو لە زێرە پـەراوێزی مـەخمەرە
مـەزن و رەئـیسی عـێل و خـەوانـینی مـوکری‌یە
سـەر تـاقەدەم لە عـەقل و شـەجاعەت مـوسەووەرە
راوەسـتە هـەندێ لەبـەر دەرکـی خـێوەتـا
ئـیزنێ بـخوازە، زۆر بـە ئـەدەب پـەردە لابـەرە
دوای سـەلام، زۆر دوعـای خـێر و ئـیشتیاق
بـۆ عـەرزی ئـەم نـیازە ئـیجازێکـی وەرگـرە
عـەرزیانکە، بـێتـو عـەرزی نـیازم قـەبوول بکـەن
مـەمنونی لوتـفی ئـێوە دەبـم تـاکـو مـەحشەرە
ئـەمجارە کـاکـە سـەعیدم بـۆ بـنێرنـەوە
بـۆ هـاتنەوەی هـەمیشە دوو چـاوم لە بـەر دەرە

جەوهەریی دەڵێ: لەگەڵ ئەوەداکە خۆی بە دۆستم بزانێ و هۆگرم بێ، زۆر بە ئەمەک و گەرم و گوڕم، خۆشم دەوێ و پێی‌دا هەڵدەڵێم و هەڵیدەکێشم. خۆ ئەگەر خودا بەو ڕۆژە نەکاکەسێ خەیاڵی کەڵەوەکێشیی بکەوێتە سەر و ملم لە بەرانبەردا بگرێ، نووکی پێنووسانی لێوەکار خەم. وەک تیری نەبەدیی دەی‌سمێ.

نـــووکی قـــەڵەمـــی جـــەوهەریی بـــڕوانـــە چ تـــیژە
بـــۆ ک .. نـــی مـــوخالیف زە.. ەرەتـــیری قـــەزایـــە

ئەم شێعرە عەباسخانی سەلیمی لە بەری بوو من نووسیمەوە. گوتم جەوهەریی لە گەڵ کێ‌یەتی؟ گوتی بە سەعیدخانی ئەدهەمی باغچەی گوتوە کە گوایە لە دوایی‌دا دوستایەتی‌یەکەیان تێک چووە و نێوان ناخۆشیی کەوتۆتە بەینیان.

## « حیکایەتی توفڤاحەتولحەمرا »

گرێیەکم لە پارچە هەڵبەستێکی جەوهەریی دابوۆهاتبوە پێشەوە بەلایەوە گیرم کردبو (پارچە هەڵبەستی زریانە شێتە) کوتیان بچۆ بۆ لای برایم‌بەگی شاریکەند. چونکە هەڵبەستەکە باسی سەرتیپی شاریکەند (بابی برایم بەگ )ی تێدایە، ڕەنگە ئەو لە بابی بیستبێ و بۆت هەڵێنێ. منیش بە قسەم کردن و کات‌ژمێری پێنج و چارەکێکی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی چوار شەممە بەرواری ۱۳۷۶/۳/۷ی هەتاوی چوم بۆ لای برایم‌بەگ. لە ماڵێ لە جێ‌دا کەوتبوو نەخۆش بوو. زۆر کز و لاواز ببو بەلاَن بەسەر وریا بوو. خۆم ناساند و کوتم من خەریکم شێعرەکانی مامۆستا مەلاحەسەنی جەوهەریی کۆدەکەمەوە گرفتێکم بۆ پەیدا بوە کوتیان ڕەنگە تۆ بیزانی و چی دیکەش لە بارەی جەوهەریی و ئاسەوارەکانی‌یەوە دەزانی پێم بڵێ! یەکجار زۆری پێ‌خۆش بور هەڵبەستەکەم بۆ خوێندەوە بڕێک گرفتەکەی بۆ ڕەواندم. شێعرێکی زۆری لەبەربوو هی زێوەر و جەوهەریی و هی دی. لە بارەی جەوهەری‌یەوە قسەمان دەکرد، کوتی فلانکەس جەوهەریی تابڵێی زۆر مەلاچاک، هۆنەرێکی بەرز و بەدەستەلات، خەت خۆش، جوان‌چاک، خوخدەجوان، ڕووخۆش و قسەخۆش و جەفەنگیی بوو. ماوەیەک تەشریفی لە شاریکەند بوو. هەمیشە لە خزمەتی دابووم. بەڕاستی

هەر ئەوەندەم خۆشی دی و هەر ئەوەندەش بە عومر دەزانم کە مامۆستا تەشریفی لە شاریکەند بوو. نێوانمان زۆر خۆش بوو. جاری وابوو شۆخی زۆر ناسک و قسە و جەفەنگی سەیری دەکرد. جارێک بۆی گێرامەوە فەرموی یەکێ لە وەزیرەکانی هارووونە رەشید ژنێکی زۆر جوانی دەبێ کە شاعیریش دەبێ. رۆژێک ئە و ژنە دەچێ بۆ شۆرگە (حەمام) دوای خۆشوتن بە رووتی کە دێتە بەر ئاوێنەی شۆرگەکە زۆری خۆ پێ جوان دەبێ ئەو نیوە شێعرە بە خویدا هەڵدەڵێ و لە دیواری شۆرگەکە دەینووسێ و دەڕوا.

اَنالتُّفاحَةُالْحَمْراعَلَيْهاالظِّلُ مَرْشوشُ[1]

جارێک ئەبوو نەواس هۆنەری بە نێو بانگی عەرەب دەچێ بۆ ئەو شۆرگەیە بۆ خۆشوتن. کە تەماشا دەکا ئەوە لە دیوارەکە ئەو نیوە شێعرەی لێ نووسراوە، دەست بەجێ دەزانێ هۆنەری ئەو نیوە شێعرە ژنە و ژنی شاعیریش هەر دەبێ ئەو ژنە وەزیرە بێ. ئەویش نیوە شێعرەکەی دیکەی بۆ دادەنێ و لە بنیەوە ئاوا دەی نووسێ:

بِفَــ.. ج عَرْضُهاشِبْرٌعَلَيْهاالعِهنُ مَنْفوشُ[2]

---

١ - انا: ئەمن. هِیَ: ئەو. التفاحه: سێو. حمرا: سوور. الظّل: سێبەر. مَرْشوش: رژاوە خوار. بڵاوبووە.

٢ - عرض: پانایی. ظِفْر.ظُفْر: نێوک. المِسک: شتێکی رەشی بۆن خۆشە لە نێوک ئاسک دەیگرن. مَنفوش: بڵاوکراوەوە. واتە ئەو، سێوە سوورێکە کە سێبەر (مەبەست قژو موی سەریەتی) بە سەریدا هاتوتە خوارێ و شتێکیشی هەیە کە پانایییەکەی بە قەد نینۆکێ دەبێ و میسکی بە سەرەوە کراوە.

مامۆستا مانای هەر دوکیانی بۆ لێکدامەوە و فەرمووی قەت ئاگات لێکردوە ئەو ئەبوو نەواسە بێ زەوقە چۆن ئەو شتە خۆش و بە تام و جوان و شیرینەی، قیزەون و ناشیرین و پیس کردوە!؟ دەی من نالێم تۆ بلێ،هی توففاحەتولحەمرا دەبێ شتێکی پان و فلچی کولکنی وەک لنگە کلاش بێ، یان بەقەت سەرە نینۆکێکی سپی میسکاوی؟! جا تەمەشای منیش کە چۆن پیسایی ئەبونەواسم لێ کراندوە و وام جوان کردوە و رازاندومەتەوە کە بۆن و بەرامی رۆژەرێیەک دەرواو عیسان لە دوورەوە بۆی شاگەشکە دەبێ !! هێناومە (انا)م کردوە بە (هی) و ئاوام لێکردوە:

هِـــیَ الُـــتفاحةُ الحـــمراءعَـــلَیهاالطَّـــلُ مَـــرْشوشُ
بِـــــفَـ.. جٍ عَـــرضُهاظُفرٌعَلَیهاالمِسکُ مَـــنفوشُ

(مـــامۆستا هـێناویە شـێعرەکـەی لە زمـانی خـۆیەوە دارشـتوە و بـە جوانکارییەکی زۆر وورد و بەرزی کـوردانـەی وەک نـالی و وەفـایی مەبەستەکەی وا رازاندوتەوە کە توففاحەتولحەمرای ئەوەندەی دیکە لە خۆ بایی و گیرۆدەی خۆ کردوە.)

برایمبەگ دوای ئـەوەی قـسەکـەی تـەواو کـرد هـەر لەوێ وەک رابـرد نووسیمەوەو بۆم خوێندەوە زۆرزۆری پێخۆش بوو. هەستام برۆم کوتی دەبێ پێم لێ نەبڕی زوو زوو بیی بۆ لام. منیش بەڵێنم دایە. بەڵان گیر و گرفتی مانیبەدرۆ وای لێ کردم نەمتوانی زۆر زوو بچمەوە بۆ لای، هەر ئەورۆ ئەورۆم بوو کە بچمەوە لە نەکاو بیستم برایمبەگ عومری خودای کـردوە. پـێنج شـەممە بـوو بـیستم، رۆژی چـوار شـەممە بـەرواری

۱۳۷۶/۴/۴ی هەتاوی کۆچی دوایی کردبوو. زۆرم پێ ناخۆش بوو بەلاَن چ دەکرێ؟ خودا لێی خۆش بێ.

جەوهەریی لە وڵامی نامەی خەلیفە سەیید خدری داشاغلداپڕیسکەی دڵی بۆ دۆستی بە وەفای دەکاتەوە. دەستکورتی و هەژاری و پیری و لێقەوماویی خۆی لەگەڵ بیر هێنانەوەی ژینی رابووردوی و چۆن بوو چی لێ هات لەم پارچە هەڵبەستەدا دەردەبڕێ. وا دیارە جەوهەریی هێشتا لە موکریان بووە و نەڕۆیشتووە بۆ دزە. ئەم شیعرانەی کوتووە.

سەلامون عەلەیک، عەلەیکە سەلام
سوولالەی پاکی رەسوولی ئەنام
جەنابی ئاغای سەییدی سەروەر
خەلیفەی بەراست ئاغای سەیید خدر
شاعیر و ئەدیب خۆش خەت و خۆشروو
ماقووڵو نەجیب، خوشخولق و خۆشخوو
سەر حەلقەی زیکری شەو و بەیانی
مەزهەری لوتفی غەوسی گەیلانی
دەنگی تەهلیلت پیاو دەسووتێنێ
سۆزەی ئەبشعارت دل دەرفێنێ
ئەشعارت گەیشت نامە سەر چاوم
کردم بە نووشتەی سەر و کلاوم

بۆنم پێوە کرد نەشئەی دابەسەر
عومری جوانیم لە نوێ هاتە بەر
بێنی چەند خۆش بوو وەک میسکی تەتار
تازە هاتبۆدەر لە کولبەی عەتار
چاوم روون بۆوە بە خەتی خۆشی
بوو بە دەرمانی دەرد و نەخۆشی
بە مۆژدەی ساغییت دلی حەزینم
شاد بوو، ساریژ بوو کۆنە برینم
لە خودا دەخوازم هەر بە دەماغ بی
پایە بلند و سەلیم و ساغ بی
لە هەردو دونیا مەقسود حاسل بی
هەر وەک کاملی هەروا کامیل بی
پیرو ناتەوان بە سەر زیندووم
بە حاڵ دەبزووم دەڵێی مردووم
ولاغی سواری و باریم نەماوە
پیادە کەوتووم ئەژنۆم شکاوە
هەرگیز گلەیی لە من مەفەرموو
باریک بوومەوە هەر وەک تاڵە موو
ئەگەر بمبینی بۆ حاڵم دەگری
دەڵێی هەزار حەیف بۆ تۆ جەوهەری

کوا عەیش و سەفای باغی جووانی؟
کەوتویە سەحرای پیریی و زورهانی
کوا خەتتی خۆشت کوا ئینشاو ئیملات؟
قەلەمدانی گوێز، قەلەم و دەوات؟
کوا سەرو سواریی، دەست و جلەوت
پرمەی ماینی شێ، سەدای هەوهەوت؟
کۆوا تولەو تاجی راوی لاپالان
لە سەختی قەلبەو لە دەشتی دولان[1]
کوا ران و رکێف، زینی ساچاخدار
چەکمەو کەوشی رەش بەرقی و سیرەدار
کەوای بۆرسای شام مێزەرەی کەتان
لە خۆت شیرن بوو شنیلی لای شان
کوا حەلقەی دەرس و دەوری فەقێیان
ئوسول و فروع، تەفسیر و قورئان
چەغمینی و تەشریح لە عیلمی هەیئەت
ریسالەی حیساب کەلام و حیکمەت
کوا حەلقەی خەتمی بابی ئەهلوللا
حاجی خەلیفە مەلا عەبدوللا

---

١ - قەلبە و دۆلان: هەردوکیان مووچەی باخچەن.

کوانی خانەقای جێگای سالیکان
کوا وەتاغی بەرز جێگای ئاغاکان
کوا شوغلی سۆفی کوا جەزبەی مورید
کوا حاجی یاقووب، کوا سۆفی سەعید
کوا بزن و مەڕ و گیسک و کاوڕت
چلە بەندانی دەوری چادرت
کوا ماین و جوانوو، دوو و سێ و چووار
بەهاران دەچوون بۆ رەوەو هەوار
کوا مەزرا و مووچە و ئاش و بناوان
خرینگەی داسی رەنجبەر و سەپان
براگیان هەرچەند ئەوزاعم وایە
رازیم بە قەزا کاری خودایە
زاهیر تێک چوە باتین ئابادە
فکرم لە سەرخۆ قەلبم ئازادە
ئەعزای زاهیرم راستە سەقیمە
فیکرو حەواسم جەمع و سەلیمە
بە نووری ئیمان دڵم رەوشەنە
لە لوتفی خودا دلم گولشەنە
لە کتێبا دیوتە مەعنای دەزانی
قەلبول موئمینی عەڕش و ڕڕەحمانی

هەر وەک کوترا جەوهەریی بە سەری پیریی ژیانی لێ شێواو چو بۆ دزە بۆ خزمەت حاجی سەیید عەبدوڵلاە. ڕۆژێک جەوهەریی تەمەشا دەکا ئەوا بەفر دەوری دزەی داوەو هێشتا کوورەش دانەنراوە. ترس هەڵی دەگرێ و ئەو دو شێعرە دەنووسی بۆ حاجی سەیید عەبدوڵلا.

بـــەفر هـــاتە خـــوار بـــۆ دەوری دزێ
لە تـــرسی ســـەرما دڵم دەلەرزێ
کـــە بـــێتوو وا زوو کـــوورە دانـــەنرێ
بـــێشک (جـــەوهەریی) لە ســـەرما دەمـــرێ

حاجی سەیید عەبدوڵلا کە ئەو شێعرانەی پێ دەگا جارێ خێرا باڵتەیەکی کەوڵی بوخارای بۆ دەنێری و دوایش بۆ خۆی کورەی بۆ دەباو بە دەستی خۆی بۆی دادەنی و قورئانێک و دەلایلێکیشی دەداتێ.

جەوهەری لە خۆشیا کەشێخ زوو بە هاواریەوە هاتوەو دەستی قەدرێکی زۆریشی لێناوە و سەرتاپاخەلاتی کردوە، هەموو تاڵی یەکی لەبیر دەچێتەوەو زۆر خۆی بە بەختەوەر دەزانێ، ئیدی گوێ ناداتە قـوورە و نوورزەی حەسوودو چاوبەرایی نەدنی ئەو بە هێند ناگرێ، بە بەندان ڕوو دەکاتەوە شێخ و دەڵێ:

مـــەقامی شـــێخ زۆر بـــەرز و بـــڵنـــد بـــێ
دەگـــەڵ مـــن زۆر بـــەلوتف و ئـــیلتیفاتە

بەجوببە و مێزەرە و کەوڵی بوخارا
سەراپا جەوهەریی غەرقی خەلاتە
لەوان چاکتر کەلامولڵا و دەلایل
کە خوێندنیان بە حەق مایەی نەجاتە
لە بۆ من سەر بلندیی و ئیفتیخارە
لە نێو بێگانە و ئەهلی ولاتە
ئەوەی دۆستن دەڵێن زۆر زۆر موبارەک
حەسوودیش زۆر خەفە و غەمبار و ماتە
چ دەربەستم حەسوود با هەر بسووزێ
قسەی حاسید لەلای من بێ مەناتە
ئەگەر سەد پیر و ئوفتادە و زەعیفم
لە سایەی شێخەوە بەختم لە هاتە
حەسەن عەهدێکە بەستوویە لەگەڵ تۆ
هەتا مردن لەسەر عەهد و وەفاتە
ئەمن پیر بووم و عومرم زۆر نەماوە
ئەتۆ خۆش بی سەر و قەلبم فیداتە
ئەگەر بمرم لەسەر دنیاش نەمێنم
بە دیدارت قەسەم رۆحم لە لاتە

خەلیفە سەیید خدری داشاغل[1] بە ئەحمەدی مزگەردا نامەی هەوالپرسی دەنێرێ بۆ جەوهەریی لە دزەو جەوهەرییش وەلامی دەداتەوە

جەنابی موستەتاب ئاغای سەیید خدری داشاغل
خەلیفەی قادری یەعنی تەریقی غەوسی گەیلانی
گەیاندی ئەحمەدی مزگەر، رەقیمەی عەنبەرینی تۆ
کراسی یوسفی هێنا لە بۆ یەعقوبی کەنعانی
وەرم گرت و لەسەر چاوو سەرم داناوو ماچم کرد
سرور و نووری بەخشی بۆ سەرو بۆ چاوی زولمانی
بە خەتتی خۆش و شیرینی، بە شێعر و نەسری رەنگینی
وەکو ئاوی حەیاتێ دای بە حالم عومری نۆجوانی
بە موژدەی سیححەتی زاتی شەریفت شاد و مەسرورم
دلم پشکووت وەکو گولخونچەیی باغی حەسەنخانی
لە روی لوتف و موحیببەت گەر دەپرسی حالی بەندەی خۆت
بیحەمدیللا لە سایەی ئیلتیفاتی شێخی گەیلانی

---

١ - داشاغل دێیەکە، کە کەوتۆتە رۆژهەلاتی بۆکانەوە لە سەر جادەی سایەنقەلاو بۆکان

هەتا فەرمووی بە کەیفم مەنزلم تەنیایە زۆر گەرمە
هەموو ئەسبابی سازە کوورە و فەرشی خۆراسانی
لەشێوەی دۆستیو مەیلت گەلێ مەمنونو مەرهوونم
کە ئەم بەندەت لەبیر ماوە لەدوای موددێکی توولانی
مەفەرموو جەوهەریی حەیفی غەریب و دوور وەتەن کەوتووی
بە گولزاریی وەتەن نادەم غوباری دەرکی گەیلانی
وەرە با پێت بلێم ئەو شێخە کێیە تاکوو بیناسی
جەنابی حاجی سەید شێخ عوبەیدیللاهی گەیلانی
چرای ساداتی شەمزینە سیراجی میللەت و دینە
نەوەی تاهاوو یاسینە لە سولبی غەوسی گەیلانی
لەبەر چاوی هەموو کەس خۆشەویستە جوان و شیرینە
چ شیعی بێ چ سوننی بێ چ تەوریزی چ تارانی
مەقامی شێخ بلندە پادشاهان حورمەتی دەگرن
عەسای پرلەعل و یاقووتی لە بۆ نادر شاهی ئێرانی
لە لوتفی حەق تەعالاوە لە هەر چوار فەسلی سالیدا
زیارەتگاهی ئەشرافە دەر و دیوار و هەیوانی
لە هەر لایێ دەبینی بۆ تەوافی دین لە ڕێگای دوور
لە ئەشراف و مەلاو ئاغا، لە گەرمێنی، لە کوێستانی
لە دیوانخانەیی ئەودا کە دانیشتن لەسەر سفرە
فەقیر و دەولەمەند وەک یەک لەبۆیان دێ بەیەکسانی

پەنایێکی بڵندە، عالی‌یە بۆ دین و بۆ دنیا
خودا هەر پایەداری کا، هەتا دنیا دەبێ فانی
« جەوهەریی لە دزە بیرو تاسەی دۆستانی و وڵات و دیداری »
« مەلاساڵحی برای و نەوەکانی دەکا »

هەوای دیداری یارانی وەتەن کەوتۆتە سەر فکرم
هەتا ئەم جار دەیانبینم بەچاوانم، خودا نەمرم
لە هیجرانی مەلاساڵحی برام و دوو نەوەم دایم
بە چاوی پڕلە فرمێسکم کوڵی گریان و شین دەگرم
بە ئیزنی حەزرەتی شێخ چەندە پێم خۆشە بە دڵخۆشی
لە ورمێ سواری ماشین بم جەوازی ڕێگە وەر بگرم
لە سابلاغ و لە میاندواو و لە بۆکان تێپەڕم یەکسەر
لە هیچ لایێ هەتا سەر مەرقەدانی باغچە خۆ نەگرم
لە نێو ئەو سێ خەلیفانە[1] بە ئیخلاس و بە هوشیاریی
لە ئەرواحی ئەوان زاتانە فەیز و بەهرە وەر بگرم
لەبەر پێی باب و دایک و زۆر سەری کاکە عەلی چەند ڕۆژ
بە گریان سەر لەسەر ئەو مەرقەدانە ساتێ هەڵنەگرم

١ - سێ خەلیفە بریتین لە: ١ - حاجی خەلیفە مەلا عەبدوڵڵای زەردەدڕو
٢ - خەلیفە مەلا موحەممەد ئەمینی باغچە ٣ - خەلیفە شێخ قیوم مەهابادی

به چاوی پڕله ئەسرین دەست هەڵێنم ڕەببی ئەمجارە
بە ئیمانێکی زۆر کامیل بە لوتف و ڕوحمی تۆ بمرم

«قازی خزری ئیمام جومعەی شنۆ شێعری جەوهەریی تەخمیس‌کردوە»

نە مەستی نەشئەیی خەمرم، نە خۆ پیری خەراباتم
نە ئەهلی فیرقەیی تەزویر، نە دارای کەراماتم
نە ساحیب کۆت و زەنجیرم، نە خاهانی مەقاماتم
نە حیزبی کۆمەلە و تودە، نە پابەندی دیموکراتم
نە جوزوی نەهزەتی میللی، نە ئەربابی سیاساتم

لەنێو تاق و سەرای شاران ئەمن ساحیب شەباکێک نیم
لە نێو بەحری فەساحەتدا ئەمن دارای کەلامێک نییم
ئەگەرچی ئەهلیعیرفانم لە لای کەس من خەیاڵێک نیم
لەسەر ئەم عەرزە پانەماڵێکی یەک بەستە خاکێک نییم
عەمامە و خەرقە و بەرماڵە ئەسباب و موهیمماتم

وەرن یاران تەفەککورکەن نەما دونیا لە بۆ تالووت

ئادەم نە بۆ مووسا نەبۆ داوود نەبۆ جالووت
دەبێ ئومیدم چۆن پێی بێ‌زەعیف وکونە و فەرتووت
ئەمن پیرێکی حەفتا ساڵە عومرو پێ لە سەر تابووت

هەمیشە قەبرو کفن و مردنە فکر و خەیالاتم

خـــــزری ... لـــــه بـــۆ قـــهبــرو قـیـاپـهتـه
لــــه رۆژی حــهشـردا دیــن و رەسـولــوللا زامـنتـه
نه خەرقەی حـیلەو تـەزویر، وەیـا سـەرپۆشـی نـاییـنتە
لەحەد بانگم دەکا ئەی (جەوهەریی) زوو وەختی هاتنتە
له جوابدا پێی دەڵێم تۆ مونتەزیربە وامنیش هاتم

تەوانا کە مەئمورێکی ئیدارەی دەغڵ و دان (غەللە)ی ئـەو سـەردەمەی بۆکان و خەڵکی سنە دەبێ دەچێتە سەر سالاری ئاغای ئالبلاغ[1] بۆ گەنم بۆ یانەی دەغڵ و دانی بۆکان. سالار گەنمی نابێ بداتێ و ئەویش دەستی لێ هەڵناگرێ. جەوهەریی کە لەوێ دەبێ سالار کارەساتەکەی بۆدەگێڕێتەوە. جەوهەریی دەڵێ سالار شێعرێکم بۆ هـاتوە. بـینووسەوە بـیبە بـۆتەوانـا. ئەویش دەست بە جێ دەینووسێتەوە دەیبا بۆ تەوانا و دەڵێ گەنمم نییەدا لەباتی گەنم تەنیا ئەم شێعرەم هەیەا تەواناش شێعرەکەی لێ وەر دەگرێ و دەیخوێنێتەوە. تەماشا دەکا داواکەی بۆ جێ بەجێ نابێ، ناچار دەست لە سالار هەڵدەگرێ. جەوهەریی بە فریای سـالار کـەوت و بـەم شـێعرە لە دەست تەوانای نەجات‌دا.

هـــەردەمانهێنـــێ و دەمـــانبا ئـــیقتیسادی بـــۆ گـــەنم
چیچ نەما تەحویلی غەللەی دەم، مەگەر ک.. رمو گو.م

---

۱ - ئالبلاغ : دێیەکە لە حەوت هەشت کیلۆمیتری ڕۆژهەلاتی بۆکان

چنان سیلاب ازچشمم روان شد بر سر کویت
گرفته سیل توفان سرشکم قصر و بارویت
باامید وصالت کعبه کردم خاک درگاهت
وضو زآب سرشک و قبله‌گاهم طاق ابرویت
دل و دین باختم اندر هوای وصل تو لیلی
چو مجنون ماندم آخر در طلسم چشم جادویت
ز سودایت چنان رسوا شدم کافر شدم آخر
چو کنعانی کمر بستم بزنّار دو گیسویت
به یک تیر نگاهت صید دلهارا بیفکندی
فغان و نالهٔ افتادگان آید ز هر سویت
مپوشان چهره از باد سحرگاهان که تاآرد
بمشتاقان و عشاقان رساند نکهت مویت
پس از مردن گذر کن بر مزارم ای مسیحادم
که تا جان باز گردد از شمیم عطر شب بویت
عجب نبود اگر بر کافران دوزخ جنان گردد
اگر باد صبا بوئی برد از کاکل و مویت
نه‌تنها (جوهری) پابستهٔ این دانه و دامست
هزاران پارساپابند زلف و خال هندویت

بهرسو واله و شیدایی دلدار میگردم
عبث در آرزوی یار میگردم
ز سودای رخ جانان کشم آه و فغان هردم
نپنداری که مست و بیخودم هشیار میگردم
هوای کوی لیلی با سرو نادیده بادیده
بامید وصال یار مجنونوار میگردم
بسوی کاکل و مویش زعطر و برگ شب بویش
چو بلبل در پی رویش بهر گلزار میگردم
زشوق قد رعنایش بطوف سرو بالایش
همی نالم چو قمری بر لب جوبار میگردم
بدام و دانهٔ زلف سیاه و خال هندویش
چو صنعانی بدام و حلقه و زنّار میگردم
به سیل اشک چشمم خانهٔ دل پایه ویرانست
به تعمیر خرابیها پی معمار میگردم
توئی آب حیات من، زمن پنهان چرا هستی
ندانستی به پیدایت سکندروار میگردم
بحال من ببخشایی، نقاب از چهره بگشایی
جمال خویش بنمایی من از دیدار میگردم
متاع (جوهری) یک جان و آن هم باشدت قربان
بسر گرد سرت همچون سر پرگار میگردم

بروزانه پی گاوان دویدن
بشب بی شمع در گلخن خریدن
بتابستان چو مرغان بیابان
بکوه و دشت و صحرا دانه چیدن
بدست و ناخن و دندان دو پشته
مغیلان کندن و درپا خلیدن
زنیش عقرب و سمّ الافاعی
چشیدن یکدم و یکدم مکیدن
یکی نان تهی بی آب و بی دوغ
پنیر و چربی و چایی ندیدن
حصیر بوریا در زیر پهلو
پلاس کهنه تا زانو کشیدن
بپای خود روی در پیش جلاد
به چشم خویش مرگ خویش دیدن
بنزد (جوهری) بهتر از آنست
زدو نان منت دو نان کشیدن

«تخمیس میرزا علی معتمد کردستانی بر غزل سابق»

«مرحوم جوهری»

مه حوری نژاد ای من فدای خال هندویت
هزاران جان شیرین بستهٔ یک تارگیسویت
زدرد دوری روی و لب و چشمان و ابرویت
چنان سیلاب از چشمم روان شد برسر کویت
گرفته سیل و توفان سرشکم قصر و بارویت

شدم دیوانهٔ آن خال و خط و روی چون ماهت
بجاروب مُژه هر لحظه می‌روبم سر راهت
اگر چه نیستم یک ذرّه از عشق تو دلخواهت
بامید وصالت کعبه کردم خاک درگاهت
وضو زآب سرشک و قبله گاهم طاق ابرویت

زهجرانت همه شب می‌رود از چشم من سیلی
شدم زار و ضعیف و ناتوان از جور تو خیلی
نکردی بی‌مروّت یک زمان بر سوی من میلی
دل و دین باختم اندر هوای وصلت ای لیلی
چو مجنون ماندم آخر در طلسم چشم جادویت

نگشتی ای طبیب بی‌وفا بر حال من ناظر
نکردی یک نفس تأخیر ظلم و جور ای جابر
چرا رحمی نخواهی کرد برعشاقت ای کافر
زسودایت چنان رسوا شدم کافر شدم آخر
چو صنعانی کمر بستم بزنّار دو گیسویت

بشهرستان حسن ای جان من بی مثل و مانندی
هزاران روسی و هندی بتار زلف می‌بندی
به حسن صد چو شیرین و زلیخایی بمن خندی
به یک تیر نگاهت صید دلهارا بیفکندی
فغان و نالهٔ افتادگان آید زهر سویت

زهجرت چشم من شب تا سحر لعل و گهر بارد
بنازم گنج رویت راکه هم این و هم آن دارد
نسیم گلستان بی روی تو زخم دلم خارد
مپوشان چهره از باد سحرگاهان که تا آرد
بمشتاقان و عشاقان زساند نکهت مویت

توئی شیرین شهر حسن و من بیچاره فرهادم
زتاب خنجر ابروی تو از پا در افتادم
بزخم تیر مژگانت شدم مقتول و جان دادم
پس‌از مردن گذر کن برمزارم ای مسیحادم
که تا جان باز گردد از شمیم عطر شب بویت

اگر یک لحظه بر وفق مرادم آسمان گردد
دمی آن دلبر رعنا به پیشم مهمان گردد
مرا بیت الحزن زآن گل برشک گلستان گردد
عجب نبود اگر بر کافران دوزخ جنان گردد
اگر باد صبا بوئی برد از کاکل و مویت

ترا چون مصر حسن و گنج و بخت و دولتت رامست
علی را زهر تلخ درد هجر و عشق در کامست
چه چاره هر دو از صنع خدا و چرخ ایّامست
نه‌تنها (جوهری) پابستهٔ این دانه و دامست
هزاران پارسا پابند زلف و خال هندویت

«در رثا و ماده تاریخ فوت مرحوم قاضی علی جوهری گوید»

چشم عبرت بین، بین سیر قرون خالیات
از تواریخ سلاطین و ملوک ماضیات
انسی و جنّی و پیر و نوجوان خرد و بزرگ
انبیا تا اولیا با کشف و خرق و معجزات
هرکه آمد در جهان آخر بباید رفت از آن
اولش بود و وجود است آخرش فوت و ممات
هر کسی در نوبت خود بار رحلت بست و رفت
این جهان باکس ندارد تا ابد پای ثبات
حبّذا آنکس که با نام نکو رفت و گذاشت
نام نیکو زنده دارد مرد را بعد از ممات
هرکه خواهد در جهان با نام نیکو بگذرد
خود بماند در جهان چون حضرت قاضی القضات
حضرت قاضی علی علّامه دوران خود
ترجمان اصل و فرع و دین و فقه و بیّنات
در ریاض و زیج و اسطرلاب ثانی بوعلی
فیلسوفان کنون از حکمتش هستند مات
معدن جوو عطا و جامع علم و عمل
با تواضع با مهان با کهتران با التفات

پیشوای اهل تقوا و امام المسلمین
نور بخش منبرو محراب در عید و صلوات
گوهر پر نور بی همتا ز اصداف کرام
زاده از اصلاب و ار حام خیار و طاهرات
نوبتش چون در رسید و رفت از این دار فنا
تکیه زد بر چار بالش بر قصور خالدات
رکن دین بشکست از موت چنین علامه‌ای
موت عالم سِلمةالذّین گفت فخر کائنات
درّ یکتا بود و پر قیمت میان قاضیان
زآن شده تاریخ سال رحلتش (بهی القضات)
زآن صدف دو گوهر پاکیزه هستند یادگار
نوجوان بی نظیرند هر دو در حسن صفات
یک محمد جانشین حضرت قاضی علی
صدراسلامست بوالقاسم جوان پاکذات
هردو سرسبز و بلند اختر بمانند در جهان
ماتسوق الّریح فی الجوّ سحاباً ساقیات

«در ستایش شیخ عبدالقادر نهری ملقب بغوث ثانی»

خوشا عمری نثار راه یار باوفا باشد
غبار درگهش در دیدهٔ دل توتیا باشد
سری در آستان دوست با خاشاک همسر شد
بصورت برثُری باشد بمعنی برسُها باشد
شوم قربان خاک آستان پیر شمزینی
که خاک مرده دلها را نگاهش کیمیا باشد
نسب از غوث اعظم نائب شاه نقشبند است
بدین دو بال شاید برهمه عالم هما باشد
امام اولیا سر حلقه مستان بزم قدس
پناه و ملجأ هر بانوا و بینوا باشد
به بزم قدسیان دلبر به جمع خاکیان سرور
بهر دو عالم اندر، پیشوا و مقتدا باشد
دلیل سالکان راه حق شمع جهان آرا
براه طالبان دین چراغ روشنا باشد
بلند پرواز اوج معرفت شهباز لاهوتی
شریعت پرورو گم گشتگان را راهنما باشد
سمّی غوث اعظم جانشین شاه عبیداله
نهال باغ طه، اهل و بیت مصطفی باشد
بخلوتگاه وحدت محرم اسرار حق گشته
به سیر انفسی آیینهٔ قدرت نما باشد

مقامش برتر از روحانیان باشد اگر یکدم
کسی با خاک کویش همنشین و آشنا باشد
بمژگان گر کند جارو کشی بر درگهش سالک
زمشرق تابمغرب دیده‌اش عالم نما باشد
توجه گر کند یک لحظه سالک را کند مجذوب
چو یادش را مریدان انتها در ابتدا باشد
مرا باین سلوک و سیرو جذبه نیست سودائی
چو در سودای عشقش دل اسیر و مبتلا باشد
چرا پروانه آسا خود نسوزانم بشمع او
که دانم بی‌گمان اندر فنایم صد بقا باشد
در این عالم کسی پروردهٔ عشق است ای سالک
بدنیا شادمانو ناجی روز جزا باشد
زهجرش مردم و وصلش میسّر کی شود یارب
که قربان سرش گردم بپایش جان فدا باشد
خداوندا بحق شهسوار عرصهٔ لولاک
شفیعم خون مظلومان دشت کربلا باشد
تو پیر ما به نهری بازآور، پایدارش کن
که دست همتش هر درداری را شفا باشد
ترحّم بر من بیچاره کن درمانده‌ام یا رب
که این بیچاره از چنگال دست غم رها باشد
محمد بیگ را با عزّت و طاعت نگهداری
خود و فرزند دلبندش سلیم و بی بلا باشد

«در رثای حاج شیخ عبدالقادر نهری که با جمعی از خداپرستان»
«بدست پلید کمال آتاترک جلّاد شربت شهادت را نوشیدند»

بیا ساقی بده جام شراب لعل رمّانی
بقربان سرت گردم مکن بر من گرانجانی
قدح پر کن ازآن می کو نشاند آتش غمرا
که در هجران جانانم جگر پر خون و بریانی
بیا ای مطرب مجلس بزن یک پنجه بر تاری
بیاد تار زلف یار برپا کُن غزلخوانی
تو بر خون داستان هجر تامن گریه آغازم
ببارم اشک از چشمان چو آب از ابر نسیانی
فراق یار دلدارم چنان کردست سر گردان
که نشناسم سر ازپا ماندهام در فکر و حیرانی
گهی سرمست و سودایم، گهی مجنون شیدایم
گهی در گشت صحرایم، گهی در کنج ظلمانی
دل‌از دوری جانان پرز آتش دیده پراسرین
گهی چون مجمر نارم گهی در آب طوفانی
فلک تاکی ننالم چون نگریم از ستمهایت
که از چنگال ظلمت کنده شد بیخ مسلمانی
بهرجا گلبنی روید نهی در پای او خاری
چراغ روشن اردیدی بباد ظلم بنشانی

گهی بولوءلوئی را برسر فاروق برتابی
گهی از خون عثمان خط قرآن سرخ گردانی
بدست ابن‌ملجم شاه مردان را زبون کردی
بظلمت خانه خاکش سپردی جسم نورانی
سراولاد زهرا را بدست کافران دادی
بدشت کربلا خوناب مظلومان بجوشانی
مصیبتهای دورما زحد افزون شده هیهات
که از هریک اساس دین نهاده روبویرانی
یکی از دردهای تازه یاد آور فغان برکش
بسوز سینهٔ گریان از درد و پریشانی
زچشمان اشک ازدل آتش و از سینه سوز آور
که رحلت کرد از دنیای فانی قطب ربّانی
لقب شد غوث ثانی شاه عبدالقادر نهری
حسب از نقشبند است و نسب از غوث گیلانی
سپه سالار خیل اولیا سر حلقهٔ مستان
ضمیرش مخزن و گنجینهٔ اسرار یزدانی
هزاران همچو معن زائده بر گوشهٔ خوانش
طفیل خانقایش صد چو شمس و پیر خرقانی
نسیم خانقایش نکهت خلد برین دارد
در و دیوارش از ذکر خدا پرفیض و نورانی

سفر اندر وطن کار مریدان درش یعنی
مبدّل کرده اوصافات جسمانی بروحانی
ز ارشادش طریقت زنده شد همچون گل سیراب
چراغ شرع احمد از فروغش گشت نورانی
زبانش آمر معروف و دستش ناهی از منکر
بقول و فعل محکم کرد بنیاد مسلمانی
بسی زحمت کشید اندر رواج دین پیغمبر
بسی محنت چشید از راه آئین مسلمانی
بسی اندر مقام و ملتزم عزلت نشین بودی
بسی اندر طواف کعبه بنمودی ثنا خوانی
بسی اندر صفاو مروه دامن بر کمر برزد
بسعی خاطرو چشم پر از اسرین‌و عریانی
بسی اندر حجازو طائف و شامات محکم کرد
حدیث احمد مختار و احکامات قرآنی
پس‌از هفتادو چندی با تنی چند از خداجویان
زسادات و مشایخ شد اسیر ترک عثمانی
مغلل دست در گردن مقید پای در آهن
همه‌اللّه گویان بر زبان اذکار سبحانی
صف این اولیا رازیر دار محنت آوردند
طناب ظلم محکم شد بگرد نهای نورانی

بدور حق‌پرستان صف‌زده یکدسته از ترکان
چو دور ماه گیرد رشته‌ای از ابر ظلمانی
زدند آن تیره‌دلها هریکی تیری برآن پاکان
بروی خاک خون جوشید همچون بحر طوفانی
زمین‌و آسمان لرزان ملائک بر سر گریان
بنالیدند انس و جان زظلم ترکان عثمانی
روان بی تن پاک شهیدان سوی جنت شد
تن بی‌جان مظلومان بماند در خاک ظلمانی
ترا ای (جوهری) بعداز وفات پیر شمزینی
بسی بهتر بود مردن ز تاج‌و تخت سلطانی
خرد تاریخ آن قطب شهید روح در جنت
بگفتا گشته جان شاداب ابا الطاف سبحانی

« در رثای شیخ حسام‌الدین سروده است »

شاه حسام‌الدین علی سالار خیل اولیا
قطب ارشاد طریقت مقتدای اتقیا
صاحب هردو طریق نقشبند و قادری
پیشوای جمله در اوج صعود و ارتقا
وعده وصلش به ایزد آمد و با احترام
خواند حق او را بسوی بارگاه کبریا
نوبتش چون در رسید و رفت ازاین دارفنا
خیمه‌و خرگاه زده در روضهٔ دارالبقا
حسرتا بهر وفات این چنین قطب مدار
چونکه او پشت و پناه بینواو اغنیا
زخم سادات کرام نهریم را تازه کرد
رحلت بالا نشین، صدر عزّو اصطفا
(جوهری) با چشم پرآب و دل همچون کباب
گفته تاریخ وفاتش غاب شاه اولیا

۱۳۵۷ هجری قمری

« جوهری در تبریک عید به سعیدخان ادهمی سروده است »

عید قربانست و ما را نیست دلداری پدید
عالم اندر شادی و من ماتم و زار و فرید
هر یکی با دلبری همگردن و آغوش و خواب
چشم من در خواب درد و محنت و آزار دید
هر کسی با مطرب‌و ساقی برقص‌و وجدو حال
من بباد غم همی لرزم چو شاخ نارو بید
هر یکی با دوستدار خویش در صحراو باغ
من بکنج بیت احزان دل پر از نارو وحید
زخم این ایام و درد روزگار را مرهمی
نیست جز دیدار خان سعد آثارِ سعید
یاربّ این عید سعید و سایر اعیاد باد
بس مبارک برو جودش بخت سرشار و مزید
زآنکه با پای پیاده طاقت رفتن نبود
(جوهری) محروم شد از عید دیدار سعید

« جوهری خطاب به مافی رئیس امنیه مهاباد سروده است »

مرا عرضی است میگویم به‌لحن و لهجهٔ وافی
تمنای قبولش میرود از حضرت مافی
مرا جایی دهد در گوشهٔ الطاف مهر خود
نگاه گوشهٔ چشمش بحال من بود کافی
بدست لطف بنویسد بمأموران امنیه
نگهدارند قدر (جوهری) با یک دل صافی
زوصفش هرچه بنویسم مقامش برتر است زینهار
بهر جائی مجالی نیست در سجع و غزلبافی
همین دست دعا بردار و از یزدان تمنا کنی
بقدر و رفعت و عزّت بمانند حضرت مافی

***   ***   ***

« در تحسین از حُسن خط سهام‌الملک گوید: [1]»

بگو ازمن به‌ابن مقله و مانی که یک ساعت
برون آرند سرازخاک تاببینند حال عالم را
کنند تحسین و بوسند دست آقای سهام‌الملک
زحسرت تا ابد ریزند بر سر خاک ماتم را

---

۱ - سهام‌الملک: نامش محمد و پسر سلیمخان اول (حاج سرتیپ) است یکی از پسران سهام نیز نامش سلیم بوده که نوهٔ سلیمان خان اولست

« جوهری در آرزوی دیدار سعیدخان ادهمی باغچه و »
« انتظار بازگشت او از سفر سروده است »

در آن روزی که توگشتی مسافر
نه بر لب خنده نه شادی بخاطر
سرور از اهل آبادی ندیدم
بجز اندوه یک شادی ندیدم
ندیدم شادیی از اهل باغچه
لب از خنده فرو بسته چو غنچه
سماقان[1] ترشرو پیشانی پر چین
به پشت خویش بسته کوه سنگین
کونامار آنچنان گشتست بیتاب
زدیده می نریزد قطره‌ای آب
ز باغ شامه تا کوه که‌ماجاڕ
زهجرانت سیه پوشند یکبار

---

۱ - ۲ ،۳، ۴، ۵، ۶، ۷، ۸، ۱۵ مزارع روستای باغچه ۹، ۱۲، ۱۳،مزارع روستای کالی شیْته ۱۰، ۱۴، ۱۶ مزارع روستای کرکزْه هستند

چنان گردید دمادم چشم دۆلان
روان گردیده اشکش تا به سیخان
گیاه لۆ گەنە پژمرده از غم
هەنووله کرده بر سر خاک عالم
دەلوقەوواخ چشمش پر زآبست
کەلاوەش سینەاش همچو کبابست
زهجرت کانی‌شێتە گشته مجنون
سرشکش گاه خشک و گاه چو جیحون
رخ گلزەرد از غم زرد گشته
سرِ کانی‌عەلی پر درد گشته
چو کانی‌سەیدحسین و گۆلی‌قەڵبە
همی گویند و نالند نوبه نوبه
اطاق و مسجد و تالار و ایوان
رسانده آه و واویلا به کیوان
امامِزامن آن پیر خردمند
دعایت میکند پیش خداوند
همی گوید که آقای سعید خان
بهر جاهست سالم باد و شادان

« جوهری برای خیر مقدم سالار سعید حیدری نمایندهٔ »
« مکریان در مجلس شورای ملی سروده است »

یانَدیمی قُمْ فَناوِلْنِی اَلمُدامَ اَلأنـدَرِ
مِـنْ شَـرابٍ یُـحیِنی لا مِـن رَحـیقٍ مُنکِـرِ
یـا مُـغَنی هـا فَـغَنّی بِـالمُقام البـهلوی
شـابَ شَـیْبی زاد عُـمْرِی مِـنْ قُـدوُمِ الحَـیدِی
پـارسی گـوی گـر چـه تـازی افـصح و شـیرین بـود
عشـق را گـاهی حـجازی خـوش بـود گـاهی دری
وضـع دنـیا تـازه گشت و جـان نـو آمـد بـما
از قـدوم خـیر سـالار [1] سـعید حـیدری
صـاحب سـیف و قـلم دارای عـلـم و مـعـرفت
بـا شـرافت بـا دیـانت در مـقام داوری
تکـیه بـر اوج بـلندی نـیست هـر کس را روا
هـر کـفی نـبود سـزاوار حسـام حـیدری
مسـند رفـعت نـباشد جـای هـر کس در جـهان
هـر کـلاه کـج نـمی‌باشد نشـان بـرتـری

---

۱ - سالارسعید حیدری : فرزند احمد بگ، فرزند ابراهیم بـه‌گ و برادر مصباح الدیوان ادب در آن هنگام مالک روستای حاجیالیکه‌ند در حومهٔ بوکان و نمایندهٔ بوکان و مهاباد در مجلس شورای ملی ایران در زمان سلطنت رضاشاه بوده است.

ای وکـــیل مـــحترم ای پـــاکـــزاد پـــاک دیـــن
ای بـــناموس و شـــرف در مـــلک مـلت پـروری
حـــبّذا مـــلکی کـــه دارد یک وکـــیل هـــمچو تـــو
حـــمدللّه انـــدرین دوران تـــو فـــرد و نـادری
مـــجلس شـــورای مـــلّی از وجـــودت پـر فـروغ
خـــوشدل از اخـــلاق نـــیکت لشکـــری و کشـــوری
اهـــل پـــیران و گـــورگ و مـــنگور و زه‌رزا هـــمه
مـــامش و خـــانزاده و بـــیگزاده و دهـــبوکری
چشـــم و دل پـــرنور و شـــادند از قـــدوم عـــالیت
چشـــم در راهـــند گـــر بـــاری بـــدیشان بـــنگری
از قـــدومت مُکـــریان مـــا شـــده خـــلد بـــرین
جـــاودان دانـــیم خـــود را چـــون تـــو بـــرما بگـــذری
خـــواهـــم از تأثـــیر اعـــجاز رسـول هـــاشمی
تـــا زمـــین گـــردد بـــدور جـــرم شـــمس خـــاوری
احـــترامت بـــاد افـــزون، دشـــمنانت ســـرنگون
از ســـرت هـــرگز نـــیفتد ایـــن کـــلاه ســـروری
شکـــوه مـــنما زیـــن ســـپس از گـــردش ایـــن روزگـــار
شکـــر بـــر خـــوان فـــخر بـــرامـــثال بـنما( جـوهری )
زانکـــه در ظـــلّ دوســـالار ســـعید و اســـعدی[1]
یک جـــناب داد خـــواه و یک جـــناب حـــیدری

---

۱ - سالار اسعد دادخواه : مالک روستای آلبلاغ بوده

«جوهری در پاسخ غزل ملامعروف کوکه‌ای»
«که در مقدمه آمده است گوید»

ای چـراغ محافل ادبـــی
خســـرو عـــالـم ســـخنـدانـــی
فـضل و عــلم تــو در جـهان مـعروف
مـــــقتـــــدای ادیــب دورانـــی
غـــزلت مـــی‌برنــد دست بـــدست
چـــون مـتـاع ظـــریف ایـــرانـــی
در مـــقالات تـــازی و فـــرسـی
چـــون ظُـــهیر و عــدیل قـــاآنـی
در کـــلام بـــدیع هـــمچون کـلیم
در فـــصـــاحت نـــظیر ســـحبانـی
چـــــامهٔ آبـــــدار و شـــیـریـنت
قـــوّهٔ روح و قـــوت جســـمـــانـی
نـــــور بـــــخشید دیـــد و دل را
روح شـــد در قـــوای روحـــانـــی
مـــعذرت خـــواســته‌ایــد زبـندهٔ خـود
کـــه نـداریــد وضـــع مـــهمـــانـــی
چشـــم مـــن نـیست بـــرکباب و پـلو
خـــــورش و خــوردنـــی الوانـــی
ذوق مـــن بـــا کـــلام شـیرین است
کـــه مـــرا بـاد قــوت رورحـــانـــی
مـــن بـــغیر دعــای خـیر ز تـــــو
نـــبودم آرزوی جســـــمـــــانـــی

« درتبریک عصای اعطائی رضاشا به‌حاج باباشیخ جمیان‌سروده »

بیاور ساقی سیمین بدن جام سرور آور
بگـاه صبح بیرون ساز از دل غم خمار ازسر
تو ای مطرب بزن یک پنجه بر تاری بیاد یار
مغنّی خوان نوائی را بیاد خسرو و قیصر
حریفان نوبت عیش است، فرصت را غنیمت دان
غمی بر باد ده چندی بنوشا نوش را مشگر
یکی مجلس بیارائید و شمع جمع روشن کن
گلاب و عطرافشانید و عودی ریز در مجمر
صراحی باده تنگ و بطری و با جام مینائی
نی و مزمار و تار و عود و چنگ و خنیاگر
ز گرجستان و چین هر جا پری‌روئی گمانداری
ز شیراز و صفاهان هر کجا باشد یکی شکّر
ببزم، بخوان امشب نکیسا و باربد هر دو
بکام دوست میگردد بحمداللّه مه و اختر
دراین دوران که دین و ملت و دولت بکام ماست
بیا کامی برآریم از خدا خواهیم تا محشر
نگهدارد بیمن و طالع و اقبال و فیروزی
شهنشاه سریر آرا رضاشاه جهان پرور

ز قــــهرش بـــاز از کــبک دری مـــنقار مــی‌بندد
ز عــدلش مــیش بــا شــیر ژیــان گــردید هــمبستر
بــدورانش تــو گــوئی سورهٔ والشــمس در کـار است
کــه گــرگ و بــرّه هــم آبــند در هــامون و دشت و در
ســـنانش ســینه‌دوز دشــمنان دولت و دیــن شــد
چــو از تــیر کــواکب دیــو شیطان گشــته خــاکستر
بــــرون آورده از چــــنگال دشــمن خــاک ایــران را
دو دست اجــنبی بــبریده بــا شــمشیر و بــا خــنجر
بــرفع ظــلم از مــظلوم و دفــع ظـالمان سـاعی است
دو دست هــــمتش دارد یکـــــی تــعویذ از حــیدر
کــیومرث و ز هــوشنگ و ابــاطهمورث و جــمشید
فــریدون، ســلم و تــور و ایــرج و بــهرام بــا نــوذر
انــوشیروان و خســرو، نــادر و شــاپور و شــاعباس
ز کـــــیکاوس و کــــیخسرو، ز داراو ز اســکـــندر
امـــــیران اروپـــا تـــا ســــلاطینان عـــثمانی
ز اول تـــا نـــهایت پـــادشاهان عـــجم یکســــر
بـــعدل و دانش و حکـــمت بـــبازوی جــهانگیری
نـــدیده مــادری هــمچون رضــاشاه جــهان پــرور
بـه اهـل عـلم و سـادات و مشـایخ فـایض‌الجـو داست
شــــهنشاه عـــدالت گســـتر و اســـلامیان پــرور

بـــــخلعت حــاج بــاباشیخ جــامیان را عــطا فــرمود
عــــصای پـــــر زیــاقوت و ز المـــاس و درّو گـــوهر
ســزاور عــطا و خــلعت شــاهان چــنین ذاتــی است
نــژادش کــز دو ســر بــاشد یکــی زهـرا و یک حـیدر
چـــــراغ دودمـــــان ســیّد مشـــهـــــور زنــبیلـــــی
دلش چــون چشـــم بــینا چشــم دل از دیـــده بــیناتر
عــــمل را از چــــراغ شـــرع افــروزده بــا ســتادی
طـــــریقت را بآئـــین شـــریعت داده زیب و فـــرّ
امـــام و پـــیشوای اهـــل عــلم و دانش و بـــینش
ردای مـــعرفت بــر دوش و تــاج ســروری بــر ســر
تــعالیالّـــه چـــه زیـــبد ایـــن عـــصا بـــااین یـدبیضا
چـــو اعــجاز کــلیمش خــوان بــدفع دشـــمن ابــتر
مـــبارک بــاد ایــن دست و عــصای نــور در نــورت
یکـــی بـحر ســخاو جــود یک بــحر پــر از گــوهر
بشـــاباش هــمین خــلعت نــدارد ( جـوهری ) نـقدی
بـــجان آورده جــــان بــــهر نـــثار ســـید ســرور

« درتحسین حسن خط میرزاعلی معتمدکردستانی سروده است »

از قلم پرسیدم ای شیرین نگار شهد بیز
ز آن زمـــان گشـــتی درانگشت دبـیران مشک بـیز
از کـه راضـی بـوده‌ای از ثـلث و نسـخ فـارسی ؟
دست و انگشت که دیدی خـوشنویس و سـحر خـیز ؟
خـــوش جـوابـی داد بـا ذوق و مـقام خـوشدلی
گشـــتم انـــدر اصـــفهان و رشت و یـزد و انـزلی
خـوشنویسان را بسـی دیـدم ز فـرس و تـرک لیک
خـــوشنویسی مـــنحصر در پـــنجهٔ مـیرزا عــلی

*** *** ***

« جوهری ملای روستای ( زگدراو ) در نزدیکیهای مهاباد که با»
شدت فقر و پریشانی دست بگـریبان بـوده، وضـع اسـفبار و »
« دردآور خود را در این دو بیت برای ما بازگو مینماید »

بگو ازمن به‌ابن شب تا سحر چشم بر در خدا کیست عطا
کـند یک سـبد پشکـل و دو تــه‌پاله و دوبـن گـوَنی
خـــدا مـــن نکـنم از ایــن وضـع شکـوائــــی
کــه ایــن نـصیبی است عــطا کـرده خـداونـد غـنی

« جوهری در تبریک عصای مرصع اهدائی رضاشاه به حاج سید »
« عبدالله نهری گوید [1]»

ای ساقی دلبر بده جامی ازین کوثر
مغنی خوان نوائی را روانبخش و سرور آور
از آن می کونشاند آتش مستی و مدهوشی
رباید غم زجان و دل، خمار و دردسر از سر
یکی مجلس بیارائیم و خوش باشیم تا هستیم
همه دستان براریم از خدا خواهیم تا محشر
رضاشاه جوانبخت و عدالت گستر ایران
بماند با سریر و تاج و تخت و پرچم و افسر
به هدیه حاج سیّد شیخ عبدالله عطا فرمود
عصای پر ز یاقوت و زالماس و در و گوهر
سزاوار عطاو خلعت شاهان چنین زاتی است
نسب از حضرت خیرالنساء دخت پیغمبر

۱ - این اشعار قسمتی است از قسیدهٔ عصای اعطائی به حاج باباشیخ با چند بیت اضافی که جوهری به تناسب به آن افزوده است. لازم به ذکر است که این شعر در تاریخ ۱۳۷۷/۲/۱۰ هـ ش از دفتر ( بیاز ) آقای محمد وجدی قزلچی در بوکان استنساخ گردید.

درایـــــن دوران مـــا الحــمدلله فــرد و مـــمتاز است
رســـــیده خـــان یــغمایش بــهرکس کــهتر و مـــهتر
چــراغ چشــم غــوث و زبــدهٔ سادات شـمزین است
بـــــچشم مــــردمان مـــحبوب و از ارواح شـــیرینتر
مـــــبارکباد ایـــــن دست و عــصای نــور در نـــورش
یکـــــی بـــحر ســخا وجــود، یک بــحر پــراز گـــوهر

. . . . . . . . . . . . . . . . . . .

. . . . . . . . . . . . . . . . . . .

بــــخواه ای ( جـــــوهری ) از بــــارگاه ایــــزد تــنها
دوام ایـــــن چــــنین پشت و پــناه و مـــلجأ و ســـرور

« ماده تاریخ قصر حاج سید عبداله گیلانی به تاریخ قمری »

حضرت شیخ اجل زبدهٔ گیلانیان
مرشد شرع و طریقت قدوهٔ روحانیان
حاج سید عبداله مظهر لطف خدا
بحر سخاو عطا مرجع اسلامیان
ساخته یک قصرنو زیب چو قصر بهشت
مقدم او خیر باد بر همه گیلانیان
با قمری ( جوهری ) ماده تاریخ او
قصرنو زیب شیخ سال بنایش بدان
لطف خدا یاورش عزت و رفعت قرین
تا که بود مهر و ماه زیرنهم آسمان

« ماده تاریخ قصر شیخ بسال شمسی »

حضرت حاج سید عبدالله

شیخ و اولاد غوث گیلانی

لقب او شده سراج الدّین

شهرت او شده گیلانی

مرشد و پیشوای اهل طریق

عالم و مقتدای روحانی

قصر از نو نهاده در دیزج

نسخه‌ای از قصر ساسانی

مقدمش خیر باد و فرخنده

بر همه اهل آل گیلانی

ماده تاریخ او بخورشیدی

قصر شیخ اجل چو برخوانی

« جوهری موقعی که در قریه ( راژان ) ده سید موسی فرزند »
« مرحوم حاج شیخ محمد گیلانی زاده بوده حاج شیخ عبدالله »
« را بخواب‌می‌بیند، وقتی بیدار می‌شود چنان شور و حالی به
« او دست می‌دهد که بی‌اختیار اشعار زیر را می‌سراید »

شاهدی دارم ز مهر خاوری پر نورتر
شعله تابد بر جهان از خاوران تا باختر
ساقی بزم محبت فیض بخش سالکان
جذبهٔ مهرش کشد هر کس که خواهد پیش در
چند هزاران باز و شاهین و هما و عندلیب
در کمند همتش چون مرغکی بی بال و پر
رشته‌ای از مهر خویش انداخته در گردنم
میکشد هرجا که خواهد، میروم با بال و پر
جرعهٔ جام محبت داد و شیدایم نمود
مست و سرگردان چو مجنونم بکوه و دشت و در
همچو پروانه بدور شمع رویش در طواف
بی سر و سامان همی سوزم ز سر تا بال و پر
ای سرج‌الدین نهری دست بدامان توام
این غلام آستانت محو منما از نظر

یک نگـــاهت ســـوی بـــنده تـــو تیاو کـــیمیاست
چشـــم روشـــن مـــی‌نماید دل کـــند خـــالص چـــوزر
حـــمدلّله شـــاه خـــوبانی چـــنین دیـــدم بـــخواب
صـــورت و قـــامت بـــلوح سـیم نـقش و مســتطر
ای تـــو شـــاه دهـــلوی مـــن خـــاک پـــای خـــالدم
لطـــف فـــرمائی تـــو هـــم بـــا ایـــن غـــریب دربـــدر
یک تـــوجه کـــارفرما بـــهر ایـــن پـــیر غـــلام
بـــاز گـــیرد نـــوجوانـــی را ز ســـر پـیرانـه ســـر
( جـــوهری ) گـــر نـیستی مـجنون پـیر نـهریه
تـــو کـــجا و دیـــزج و راژان و دشت مَـــزْگَـــوَر

« جوهری برای خیر مقدم بازگشت سیّد موسی »
« گیلانی زاده از سفر سروده است »

ای چراغ خاندان نقشبندی و قادری
اهل بیت مصطفی اولاد پاک حیدری
حمدللّه از سفر بازآمدی شاد و بکام
نور بخشیدی بچشم ما چو نجم مشتری
منزلت بادا مبارک مقدمت باخیر باد
حق تعالی بخشدت قدر بلند و برتری
خواهم از انفاس سادات کرام نهریه
تا زمین گردد بدور جرم شمس خاوری
رفعت و مالت سعادت بخش باشد هم‌قرین
از سرت هرگز نیفتد این کلاه سروری
جان فدای آستان آل گیلانی بود
تابماند در جهان جسم و روان ( جوهری )

« برای ماده تاریخ قصر سید موسی سروده است

جناب سید موسی زنسل پاک حسن
بنا نهاده سرایی چو قصر شاه‌یمن
فرمود (جوهری) چه‌بود ماده تاریخش
گفتا حروف قصر سعادت قرین من

## ئەم بەرهەمانە لە چاپ دراوە:

تووکایەک لە قەفەزدا: نووسەر نیمایوشیج. وەرگێر کەمال مەریوانی

دیاری سنە : بەشێک لە دیوانی مامۆستا ئەهوەن

دیوانی بێسارانی : لێکۆڵینەوەی حەکیم مەلا ساڵەح

دارمێخەک : دیوانی بریندار. ئامادەکردنی حەسەن گۆران

آشپزی کردستان : ئامادەکردنی :کۆمەڵێک نووسەر

## بەم زووانە لە چاپ دەدرێ

مریشکە قوڵە : نووسەر عومەر خوسرەوی

مەڕۆکە و بزنۆکە : نووسەر عومەر خوسرەوی

دیوانی تاهیربەگی جاف : لە ئامادەکردنی حەسەن گۆران

چیرۆکی سواری مار ـ لە سەر شێعری سواری ماری مامۆستا هەژار

نووسین و ئامادەکردنی رەسووڵ رەش ئەحمەدی

ئاوەز و نەوین: بەشێک لە دیوانی مامۆستا تۆفیق مەحموودی (ئۆستا)

گوڵی گوڵزاری نەهری هاتە نێو باغ
چرای ساداتی شەمزین هاتە «سابلاغ»

---

ئەی جەنابی موقتەدیر ئەی هەمدەمی شەوگاری دوور
بۆچ رەفیقی خۆت بەجێی هێشت و بە تەنیا چوویە ژوور

---

هەوای ئاو و هەوای شاری «سنەت» کەوتە خەیاڵ و چووی
بە سەد زەحمەت کە دامەزرای لە حوجرەی دارولیحسانی



سنندج خیابان شهدا پاساژ عزتی تلفن ۲۲۶۵۳۵۳
نرخی ۶۰۰ تمەنە